


**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **دیداربینییەکانم**

- نووسینی: **عەبدوڵڵا سەڕاج**
- نەخشەسازی ناوەوە: **ڕێدار جەعفەر**
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٣
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- چاپ: چاپخانە موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧١٤) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٨٨)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## ناوەرۆك

## تێبینی

ئەم دیمانانە زۆربەی هەرە زۆریان رووبەڕوو بەریکۆردەر ئەنجام دراون. دواتر رۆژنامەنووسەکان هێناویانەتە سەر کاغەز و لەو شوێنانەی ئاماژەیان بۆ کراوە بڵاویانکردوونەتەوە. لە تەواوی، یان ناتەواوی هێنانە سەر کاغەزیان..... نازانم، لە هەندێك شوێندا گرێ و ناتەواوی بەدی دەکەم.

لە زستانی ئەمساڵدا پێیان داهاتمەوە و بەدەستوخەتی خۆم هەموویانم نووسییەوە. لەو شوێنانەی هەستم کردووە پێویستی بە دەستکارییە. دەستکارییەکی یەکجار کەمیانم کردوون. دەستکارییەکەش لە سنووری وشەیەك، یان نیو رستە تێپەڕی نەکردووە. لە هەندێك شوێندا وشەیەك، یان نیو رستەم لاداوە، یان زیادکردووە، بەڵام هێما و هێڵەکانیان وەکو خۆیان ماونەتەوە. لە دیمانەیەکیشدا پرسیارێك کەوتبوو. لێرەدا هێناومەتەوە شوێنی خۆی. سوپاس و پێزانینیشم بۆ هەموو رۆژنامەنووسەکان.

**ع. سەڕاج**
**٢٠١٢/١٢/١٢ فنلاند**

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# بۆ حەسانەوەی ناخی هەڵچووی خۆم دەنووسم



دیمانە: سەعید زەنگەنە
گۆڤاری بەیان، ژمارە ١٢٣

کردوومانه به خوو پاش نەمانی نووسەران و هونەرمەندانمان باسیان دەکەین و ژیان و بەرهەمەکانیان دەنرخێنین. ئەی تاکو لەژیاندان بۆچی باسیان نەکەین؟ چاکترین پێناسەو باسکردنیش ئەوەیە، کە نووسەر، یان هونەرمەند خۆی بیلێت، یان بینووسێت، چونکە ئەمە دەبێتە بەڵگەنامەیەکی بێگەردی پاشەڕۆژ.

خوێنەرانی ئەمڕۆش ئاشنای ژیانی و بەرهەمەکانی ئەو نووسەرو هونەرمەندە دەبن، کە دەمەتەقێی لەگەڵدا دەکرێت، لەم بوارەدا چەند پرسیارێکمان ئاڕاستەی چیرۆکنووسی نوێخواز (عەبدوڵڵا سەڕاج)ی هونەرمەند کرد، ئەویش بەدەنگمانەوە هات و بەم شێوەیە وەڵامی داینەوە:

تکایە کورتە پێناسەیەك؟

لە کۆڵانی (سەیسەروەر)ی سەر بەگەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکووك لە ساڵی ١٩٣٧دا هاتوومەتە دنیاوە. ئەم کۆڵانەش بۆتە گۆڕەپانی یەکەم رۆمانم (هەڵکشان بەرەو لووتکە) و لەوێدا ناوی راستەقینەی دراوسێکانم تۆمارکردووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییم هەر لە شاری (گاورباخی) تەواو کردو چوومە خولی پەروەردەیی و لە ساڵی ١٩٥٥ بووم بە مامۆستای گوندی (هەفتەغار).

بێگومان ئەمیش لە هەمان رۆماندا دەردەکەوێ، کە چۆن بە شەمەندەفەر دەچوومە ناو دێ و بەشەوانە سەگ تێم دەورووکان. لە ساڵی ١٩٨٥دا خانەنشین بووم پاش ئەوەی (سی) ساڵی رەبەق مامۆستایی- بیست ساڵی بە وتنەوەی ئەلفوبێ و ئەوەی دیکەی بە وتنەوەی نیگار لە ناوەندی و سەرەتاییەکاندا.

دەرفەتێکی چاکە بڵێم: کە یەکەم چیرۆکم (ڕاوە گورگ) لە ساڵی ١٩٧٣ لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری (بەیان)ی خۆشەویستدا بڵاو کرایەوەو بەمەش زۆر شادمانم ئەمڕۆکەش، لەسەر لاپەڕەی هەمان گۆڤاردا رێزم لێ دەگیرێ و پرسیارم لێ دەکرێت. پێش ئەو چیرۆکە، لە گۆڤاری (رزگاری)دا، ژمارەکانی (١١-١٢-١٣) شانۆنامەی (کوورەی ئاسنگەر)م

بڵاوکردەوە. لە یەکەم چیرۆك (٣)سێ دینارم وەرگرت و دوو دیناری تریشم خستە سەری بۆ ئەوەی پاسکیلێکی سێ پاچکە بۆ نۆبەرەکەم (شوان)بکڕم، ئەمەش لە پۆستەرە چیرۆکی (پاسکیل)دا دەردەکەوێ. هەتاکو ئەم کاتە، سێ کۆمەڵە چیرۆکم بە چاپ گەیاندووە.

بێجگە لە زنجیرە لێکۆڵینەوەیەکی هونەری لەمەڕ شێوەکاری و... لە (هەفتەنامەی هاوکاری) لە سی و یەك ژمارەدا هاتە بڵاوکردن. یەکەم کۆچیرۆکم (لاکێشە رووناکەکان) و دوا بەدوای (مردوو خەون نابینێ)، پاشان (بارام ناوێك هەبوو). بەم زووانەش کۆ چیرۆکی (پەڕەنگ) دەبەخشمە کتێبخانەی کوردی، کە بریتییە لە دوانزە چیرۆك. هەروەها هیوادارم رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە)ی ناوبراو بگاتە گەرووی چاپخانە، بەلامیشەوە مەبەستە، چونکە ئەزموونی یەکەممە لەم بوارەو گەلێ لایەنی هونەری و تازەگەری و رێبازە جۆر بە جۆرەکانم تێدا ئاوێتە کردووەو، کەڵکی زۆریشم لە قسەی نەستەق و فۆلکلۆر و بەندوباوی میللی وەرگرتووە. ئەمە بێجگە لەوەی، کە تۆمارگەیەکی زیندووە لەمەڕ مێژووی شارەکەم و ئەو ژیانگەیەی تێدا پەروەردە بووم. لە هەردوو دیداری چیرۆکی کوریدا، بەشدار بووم. لە یەکەمدا چیرۆکی (هەشت و نیوی بەیانی- هەشت و نیوی شەو)م خوێندەوە و لە دیداری دووەمیشدا چیرۆکی (برایم شۆڕاوی). ئارەزووی تایبەتیم ئەوەیە، بەرهەمەکانم، بەگوێرەی مێژووی نووسینیان جارێکی تر لە بەرگێکی قەشەنگ و بێ هەڵەدا لەچاپ بدرێنەوە. ئامانجی گشتیم ئەوەیە فراوانتر رێگەی بەرهەمی داهێنەرانە بدرێت. بێ ئەوەی ناوی نووسەرەکە ببێتە پەساپۆرتی بڵاوکردنەوە، ئەوساش کەڵە نووسەر و کەڵە رەخنەگر و کەڵە... و کەڵەکان لە جێگەی شیاوی خۆیان دەچەسپێن.

**- پەیوەندیی نێوان هونەر و ئەدەب چییە؟**

- لە رەچەڵەکدا، نووسین کارێکی هونەرکارییە. دەبینین هەمیشە ئەو نووسەرانە سەرکەوتوو دەبن، کە لە هونەرێك پتر شارەزان و لە کارە "سەرەکی"یەکەیاندا تەوزیفی دەکەن. بەڵێ، راستە هەر هونەرێك زمانی خودی خۆی هەیە، بەڵام لە کرۆك و بنەمادا یەکدەگرنەوە. ئێستا بارەکە لەلام بەم جۆرە دەکەوێتەوە: من کە جاروبار

پەنا دەبەمە بەر رەنگ و هێڵ و بۆشایی و بێدەنگی و رەزم (ئیقاع) و کۆلاج و مۆنتاجی کات و مۆنتاجی جێگاو.....تاد، لەبەر ئەوەیە وشە بە هانامەوە نایەت، یان کە تابلۆیەکی هونەری بە وشە دادەڕێژم، دەمەوێ بڵێم: مەرەکەبی رەشیش لە وزەیدایە نیگاری رەنگین بکێشێ، هەروەهاش لەمەڕ بەکارهێنانی گفتۆگۆ لە چیرۆکدا، کە سەر بە شانۆیە، یان سوود وەرگرتن لە رەزمی هەڵپەڕکێ و مۆسیقاو بۆشایی و سێبەر لە تاشین و هەڵکۆڵیندا.

لەبارەی چیرۆکەکانمەوە، زۆرکەس هەستیان کردووە، کە هەوێنی هونەری شێوەکاریی تێدایە، تەنانەت برادەرێك نیازی وایە باس لە رەنگ و هێڵ و تابلۆ بکات لە توێی چیرۆکەکانمدا. سەرەڕای ئەوەش کە گوتم، دەبینین هونەرمەندانمان دەست دەدەنە قەڵەم بۆ دەربڕینی هەستی ناخیان و شیکردنەوەی بۆچوون و رێباز و ئەفراندنەکانیان، ئەوەشی سەربار بێت، کە لەم چەند ساڵەی دواییەدا بووە باو، کە تابلۆ کەڵك لەشێوەی (پیت) و دەنگدانەوەی دەستەواژەو ناوەرۆك و هێمای هۆنراوە وەربگرێ، بەتایبەتی لای هونەرمەندە تاکمەوداکان (البعد الواحد) و هونەری داماڵراو (التجرید= ABSTRACT) و لای خۆمانیش هەندێ هونەرمەندی سۆفی مەشرەب، خۆیان لەو شەپۆلە دا و بگرە (چیرۆك)یانیش گلاندە تاقیکردنەوەکەوە. ئەوەی منیش کردوومە، بە پێچەوانەوە، هەندێ لە زمان و تایبەتمەندیی ئەو هونەرانەم خواستووە بۆ نوێکردنەوەو پتەوکردن و جووڵاندنی ئەدەبەکەمان، بە نموونە: لە چیرۆکی (فانتازیاو تابلۆیەکی کێوی)دا، فانتازیاکە لەوەدایە، بۆچوونی خۆمم تۆمار کردووە لەبارەی رەنگە سەرەکییەکان و تێکەڵاوکردنی تۆنەکانی TONE وەکو هێماو رەمز، هەر لەو چیرۆکەدا، چەند تابلۆیەکم (نیگار) کێشاوە، بە وشەو بەس، کە لە دوارۆژدا، هونەرمەندێك، یان خۆم ئەگەر بلوێت ئەو نیگارە وشەییانە بکەمە نیگاری رەنگ و هێڵ، بەلای منەوە، گرانترین و کاریگەرترین هەڵوێستی نووسەر لەوەدایە، لە چ گۆشەنیگایەکەوە دەڕوانێتە بابەتەکەی و چۆن وێنە هونەرییەکان هەڵدەبژێرێ و بەکامە وشەی رەنگین و کامە رستەی ئاهەنگگێڕ ناواخنی بەرهەمەکەی دەنێرێتە چاو و گیانی

خوێنەر، دەنا چی زۆرە.. ناوەرۆك زۆرە. چی زۆرە.. ژان و بێدادی و.. زۆرە. هەڵبەتە نووسەری کارامە دەتوانێ چلۆن ئەو بابەتانە دارێژێتە ناو بۆتەیەکی هونەرییەوە. لێرەدا، دەرفەتێکی باش و لەبارە ئەگەر پەنجە راکێشم بۆ پەیوەندیی توندی نێوان هونەرەکان لە بان تەختەی شانۆدا، یان لە تەلەفزیۆن و سینەمادا، ئەو دیمەنانەی کە بە وشە نایبیسین، بە چاو دەیبینین.

**- دەڵێن: مەسەلەی ویژدان، یەکەم چیرۆکی کوردییە، ئێوە راتان چییە؟**

- هەر بەڕاستی و ڕەوانی، ئەم شتە بووە بە مەسەلە بەلای منەوە دروست نییە بڕیارێکی موتڵەق بدرێت، چونکە دەشێ پێش ئەو دوو چیرۆکەی، کە مشتومڕیان لەسەرە، چیرۆکی تر نووسرابێت، وەلێ دەبێ پێوەری هونەری بەردی مەحەك بێت نەك شتی تەسکی تر. بەش بەحاڵی خۆم، یەکسانە لام ئەگەر (مەسەلەی ویژدان) یەکەم چیرۆك بێت، یان ئەو چیرۆکەی، کە لە گۆڤاری (رۆژی کورد)دا، بە ناتەواوی بڵاوکراوەتەوە، یان هەر چیرۆکێکی دیکە.

جا با ئەم مەسەلەیەش نەکەینە مەسەلەکانی ترو دڵمان بەدەیان و سەدان لاپەڕەی رۆژنامەو گۆڤارەکان بسووتێ. هەندێك ئێستاش لەژێر لێوەوە هەر مڕڕەیان دێت ئایا: (رەخنەو ئەدەبەکەمان لەکێشەدایە؟) و (بۆ کێ بنووسین؟) دەڵێم: دەمێکە گشتمان وەڵامی ئەو کێشە و پرسیارانە دەزانین و کەچی هەندێ کەس هەلاجی بە وشە دەکەن و فوو لە هەمبانەی ڕزیو و کۆن دەکەن. ئەگەر هاتوو سەرپشك کرام، کە تەنیا لە نێوان ئەو دوو چیرۆکەی ئێستاکونی لەبەر لووتدان، وا سەرەڕای ناتەواویش، دەنگ بۆ چیرۆکەکەی گۆڤاری (رۆژی کورد) دەدەم.

- پۆستەرە چیرۆك چ دەبەخشێ؟

- بەرلەوەی هەندێ پۆستەرە چیرۆك بنووسم، گاڵتەم بەم جۆرە دەهات و زۆریش بە ئاسانم دەهاتە پێش چاو، بەڵام کە خۆم لە قەرەی دا، تووشی کێشمەکێش و کارێکی سەخت هاتم لەمەڕ خەستکردنەوەی رستەکان و هەڵچنینی وشەی گونجاو و هەڵبژاردنی گۆشەنیگای هونەر ئامێز، چونکە هەر وشەیەك، سەنگی خۆی هەیە و هەر دەستەواژەیەك، نە دەبێ تەسك بێ، یان دەڵب و فش، بگرە فیت و پڕاوپڕی بیرۆکەی ئەو پۆستەرە چیرۆکە بێت، هەروەها، هەندێك بە هەڵەدا دەچن ئەگەر وابزانن ناوەرۆکی چیرۆکی کورت و ناوەرۆکی پۆستەرە چیرۆك هاوشانی یەکتری و تەریبن. بەهەرحاڵ، پۆستەرە چیرۆکم بە خزمی کورتە چیرۆك زانی، بۆیە نۆما ئەسپی خۆم تێدا تاقی کردەوە، وەلێ ئەو جۆرە دەربڕینە، بەزمانێکی پاراو نازانم بۆ لە باوەشگرتنی ژان و خولیا و کێشەو ئامبازبوونەکان. بێگومان نووسراو هەرچەندە کورت بوو، بەگوێرەی ئەوەش مەودای بڕکردنی کورت دەبێ. لەم دواییەدا، دە پۆستەرە چیرۆکم لە (بەیان)دا بڵاوکردەوە، خۆ ئەگەر هاتوو پرسیارێکم لێ بکرێت: ئەی بۆ پەنات بردە بەر پۆستەرو...؟ دەڵێم: ئەو ناوەرۆکانە هەندە لەزگین و بە پەلە بوون لە دیوی ژوورەوەمدا، بۆیە ئەو کاڵایانەیان بۆ خۆیان دیاری کردو.. بۆم هەیە، هەریەك لەو پۆستەرانە بە سکێچێکی ئاوبۆیە (ئاوڕەنگ) بچوێنم. پێشنیازم ئەوەیە، چیرۆکنووسی لاو خۆی لێ دوور بگرێت، چونکە ئەم پۆستەرانە وەکو سەراب وان، رووکەش و فریودەرن، بۆیە سەلیقە و راهێنان و هەستێکی ناسکیان پێدەوێ.

- گەلێ چیرۆکتان هەیە، کەسەکانی نامۆ نین هەروەهاش شوێنی رووداوەکان، بەڵام هەندێك دەڵێن: ڕستەکانی نامۆن؟

- خەمی سەرەکی و مەراقی هەمیشەییم لە هونەری چیرۆکدا، نوێخوازی و خۆجێهێشتنە.. دەمەوێ لە هەر چیرۆکێکدا، هەنگاوێك دوای چیرۆکی رابردووم

بکەوم، ناوەرۆکی تازە و بەشێوەیەکی نوێ بیخەمە پێش چاوی خوێنەرانم و نەوەی تازە رسکاومان، وشەکان، لە مانا سواوەکانیان یاخی بن و... دەستەواژەکان، خوێنەر رابگرن بۆ ڕامان و بیرکردنەوە، وێنەکان سەرنج بکێشن و دوور بن لە ئاسۆیی و (السگحیە) نزمی (الانحگاگ). زۆرجار بە ئەنقەست، وشە لە مەبەستە فەرهەنگییەکەی دادەبڕم و.. مەبەستێکی تری پێ دەسپێرم. وێنەی ئەوتۆ دەکێشم، کە خوێنەر راچڵەکێ و دووبارە بە رستەکاندا بچێتەوە. وشە دەقرتێنم. رستە بە ناتەواوی دەهێڵمەوە بۆئەوەی خوێنەر پڕی بکاتەوە. بۆشایی بەشێوەیەکی ئەوتۆ بەکاردێنم، کە جێگەی وشە بگرێتەوە. بە نموونە لە بری ئەوەی بڵێم (لە شەقامەکە پەڕییەوە) وتوومە (شەقامەکەی سەربڕی)، یان (تەماشای ئەوبەری کرد)م گۆڕیوە بە (هەردوو گلێنەی چاوی ناردە ئەو پەڕی جادەکە)، یان (دەستی ناردە گیرفانی) و (نیگای بە پەنجەرە ڕووناکەکەوە هەڵواسرا). لەم داهێنان و وێنەکێشانە تازانەدا، نووسەر لەخۆ جووینەوە و سووان بەدوور دەبێت و مێشکی هەمیشە لە پشکنین و ئەفراندندا دەبێت.

جاری وا هەیە لە دەرگای زمانی شانۆ و هونەری شێوەکاری و سینەما دەدەم، یان ئاماژە بۆ تابلۆیەکی بەناوبانگ دەکەم، یان رستەی کەڵە نووسەرێك دەخوازم بۆ پشتگیریی دەربڕینەکانم. جاری واش بووە (کاتی) جیاجیاو (جێگا)ی جیاوازم تێکەڵ دەبن هەروەکو چۆن لە مێشکماندا تێپەڕ دەبن و هیچ سنوورێکیان لەنێواندا نییە. جا لەکاتی وادا، پەنا بۆ خاڵبەندی و کەوانەکان و پیتی کاڵ و رەش دەبەم، ئەمانە و هەندێ خاڵی وردی تریش بوونەتە هۆی ئەو درەنگ خۆ بەدەستەوەدانەی چیرۆکەکانم، بەڵام هەمیشە وتوومە و دەیڵێمەوە، کە بەرپرسیارم لەهەر دیرێك نووسیومە و لەهەر هەڵوێستێك کە تۆمارم کردووە، یان لەهەر فۆرمێك، کە ناوەرۆکەکەم پێ دەربڕیوە.

لێرەدا دیسانەوە دەرفەتی ئەوە نییە بەدرێژی باس لە مەسەلەی ناوەرۆك و شێوەکە بکەینەوە، چونکە دەمێکە بڕدراوەتەوە. بانگی هەق بە ئاشکرا خۆشە، من بۆیە دەنووسم، چونکە شتێکم لەلایەو دەمەوێ بیڵێم و بیدرکێنم. هەندێ جار واپێویست

دەکات بیخەمە بۆتەیەکی ئەوتۆوە کە لێم بکرێ. بەهەرحاڵ ئەمە شێوەی چیرۆکی منە و وابزانم لاوان و رۆشنبیران چاودێری چیرۆکی چاك دەکەن و برێك هەمیشە دێنە لام و لە خۆم چاکتر لە بەرهەمەکانم دەدوێن، ئێستاکە وەختی ئەوەیە بڵێم: نەخێر وشەکانم، رستەکانم نامۆ نین، بەڵام را و باوەڕەکانم، هەندێ جار لە پەنای سکێچ و مۆنتاژ و وردەکاریی هونەریدا، خۆیان مەڵاس دەدەن و بۆسە دەگرن و لەپاشان وەکو کانیلەی بێگەرد لە ناخی خوێنەردا بتەقنەوە.

چاکترین بەڵگەشم ئەم چیرۆکانەن: (شیو ژاڵە) و (هەشت و نیوی بەیانی و..) و (بازنەکان) و (فانتازیا و تابلۆیەکی کێوی) و (کانی پڵنگان) و (لاکێشە رووناکەکان)ە.. سەرەڕای خەستی و چڕییان، سەرنجی زۆر کەسیان راکێشاوە. بەڵێ، خۆشم هەندێ جار هەستم بەوە کردووە کە خوێنەرێکی ئاسایی، بەسانایی کلیلی چیرۆکەکە نادۆزێتەوە، کەچی دڵنیام ئەگەر ئەو خوێنەرە جارێك و دووان پێدا بچێتەوە، ئەوا چێژێکی پوخت وەردەگرێ.

لایەنێکی تر هەیە، ئەویش: ئەی ناڵێن رەخنەگر نووسەری دووەمە و پردێکی هەموارە لە نێوان بەرهەمەکەم و خوێنەران..

**- وا هەست دەکەیت، کە تەلەفزیۆن و سینەما مێملی چیرۆك بن؟**

- نەخێر، بەڵکو تەواوکەری یەکترین، ئەوەتا شانۆ گشت هونەر و ئەدەبی — بە لکەکانییەوە- گرتۆتە باوەش، هەروەها سینەماو تەلەفزیۆن. لێرەدا پەنجە بۆ زۆر چیرۆك و رۆمان رادەکێشم، کە بەهۆی ئەم رێگایانەوە گەیشتوونەتە خەڵکێکی فراوان و چێژێکی (بیندراوی) تازەیان پێدراوە، هەروەهاش لە سایەی سینەماو تەلەفزیۆنەوە، لەسەر تەختەی شانۆدا، زۆر کەس پەلاماری کتێبی چیرۆك و رۆمان و شانۆنامە نووسراوەکان دەدەن و دەبنە خوێنەری باش.

سەرەڕای ئەوانەش، هەر لە بنەڕەتەوە، جۆری چێژوەرگرتن لە داهێنانێکی نووسراو، جودایە لە هەمان نووسراو بە بینراوی، یان بە بیستراوی. من بەشبەحاڵی

خۆم، که بەرهەمێك دەخوێنمەوە زۆر پەرۆش دەبم، لەسەر شانۆ یان لە سینەماش ببینم بۆ ئەوەی بەراوردێك لە نێوانیاندا بکەم و داهێنانی هەردوو: نووسەر و دەرهێنەر لێك جودا بکەمەوە. خۆ زۆربەمان (جەنگ و ئاشتی)مان دیوەو خوێندوومانەتەوە یان (تەنەکە) و (پالْتۆ)مان لەسەر شانۆ، یان لە تەلەفزیۆندا دیتووە و چیرۆکەکانیشمان بەرچاو کەوتووە، خۆئەگەر باس لەوەش بکەین، کە هەندێ چیرۆکی کورت، یان رۆمان کراون بە شانۆنامە، یان سیناریۆنووس کردوونی بە فیلمی سینەما، ئەمەش دیسانەوە مەسەلەیەکە و پێویستی بەناوبردن هەیە.

- لاکێشە رووناکەکان یەکەم بەرهەمی چاپکراوتە، وا هەست ناکەیت لەو (١٥) چیرۆکەی لە بۆتەیدایە (١٠)یان رووناك نین؟

- با بزانین چیرۆکەکان کامیانن: ماسی - خۆراك — کاتژمێر — شەترەنج — بە خەلْووزیش نیگار دەکێشرێ — ئۆتۆمبیل — لاکێشە رووناکەکان — مام وسوو — مانگی سەوز — پەیین — هەشت و نیوی بەیانی و هەشت و نیوی شەو — بێدەنگیش زمانی هەیە — ئاوێنە — راسپێری و سێ پۆستەرە چیرۆکی (نیوەڕۆ- شەو- بەیانی) چیرۆکی ($8\frac{1}{2}$ بەیانی...) لەیەکەم دیداری چیرۆکدا خوێندمەوە، کە جێگەی رەزامەندی و ستایشی گوێگران بوو — خەلاّتی یەکەمی وەرگرت- چیرۆکی (ماسی) و (پەیین) و (کاتژمێر) و (ئۆتۆمبیل) و (بێدەنگیش زمانی هەیە) لەلایەن برێ بەرێزەوە هەلْبژێردران و گۆڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی و (فەرەنسی)ش چیرۆکەکانی دیکە شانازییان پێوە دەکەم و ڕای هەندێ برادەری چیرۆکنووس دەلْێمەوە لەمەڕ ئەو چیرۆکانە (ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل) لای وایە چیرۆکی (لاکێشەکان) سەرکەوتووترین چیرۆکی کۆمەلْەکەیە. برای خۆشەویستم (غەفوری میرزا کەریم) چیرۆکی (مام وسوو)ی زۆر بەدلْ بوو، پاش ئەمان (محەمەد موکری)یە، چیرۆکی (مانگی سەوز)ی زۆر پەسەند کردووە بە نموونەیەکی باشی لە قەلْەم دا. مایەوە چیرۆکی (خۆراك) کە هەتاکو ئێستاکەش خاوەنی کتێبخانەی (ئاسۆ)ی کەرکوك پێم دەلْێ: لەبەر خاتری چیرۆکەکەت ئەو زەلامەت نەگرت، کە کتێبێکمی برد.

چیرۆکی (بە خەڵووزیش نیگار دەکێشرێ) زۆر ئاشکراو روونە، نە هێمای تێدایە و نە تەمومژ، هەروەها چیرۆکی (ئۆتۆمبیل) لە دایکێك دەدوێ بە دەردەسەری کوڕەکەی پەروەردە دەکات. چیرۆکی (شەترەنج) ئەزموون و تاقیکردنەوەیەکمە لەمەڕ نووسینی چیرۆکی جێگەوشت (الشیئیە)، بەڵام (راسپێری) بەشێوەیەکی ئاسایی نووسیومە. (ئاوێنە)ش چیرۆکی بەدبەختێکە، کاکیلەی ژان دەکا، کەچی مێشکی دەشۆنەوە!. هەروەکو لە چاوپێکەوتنێکی پەلەدا لەگەڵ بەرێزتان گوتم: پێشوو خوێنەرانم شارەزای هێڵە هونەرییەکەم نەبوون، بەڵام هەتا دێ بەڵەد دەبن و پتر چێژ لە بۆن و بەرامەکەی وەردەگرن. تاك و تەراش دێتە لام و لەهەندێ شت دەپرسێت، یان لە هەڵوێستێکی کەسایەتییەکان دەکۆڵێتەوە، بەڵام کەسێکم نەبیستووە سەرجەم چیرۆکێك بەگشتی بێزاری کردبێت. ئەوەی هەیە کتوپڕ خۆ نادەن بەدەستەوە وەکو هەر بەرهەمێکی تازە بابەت و تازە شێوە. من کە دەنووسم بۆ حەسانەوەی ناخی هەڵچووم دەنووسم و پاش هەر چیرۆکێك پەتایەکی سەیر دەمگرێ و حەز بەتەنیایی دەکەم، پاشان بارەکە لەلام بە پێچەوانە دەبێت و دەمەوێ کەسێك بدۆزمەوە، کە بۆی بخوێنمەوە، خۆ ئەگەر کەسێکم چنگ نەکەوت ئەوا بۆ دایکی منداڵەکانی دەخوێنمەوە، خۆ ئەگەر هاتوو ئەو چیرۆکە بەدڵی کەسانی دیکە بوو ئەوا ئێجگار کامەران و بەختەوەر دەبم، دەنا...ئەمڕۆ لەهەندێ شتم نەگەن، مانگێکی تر، ساڵێکی دیکە هەر لە دڵ و گیانی وەچەکان جێگیر دەبم. ئەمە بە دڵنیاییەوە دەڵێم و رێزیشم بۆ گشت خوێنەران هەیە.

- زۆربەی زۆری چیرۆکەکانت لە رووداوی راستەقینەوە وەرگیراون، بەرێزتان دەبنە وێنەگرێکی فۆتۆگرافی. باشە خۆتان دەتانەوێ چێ بڵێن؟

- نووسین لەشێوەی فۆتۆگراف و راپۆرتانە پێچەوانەی چیرۆکەکانمە وەك خاڵێك، بۆ ئەوەی لەکێشەکە بدوێم. من کەلە واقیعەوە وێنەو رووداو دەخوازم و دیاردەکان تۆمار دەکەم، هەروا بەکاڵی و ساکاری و رەمەکی نایانخەمە سەرکاغەز، زۆر راستە. واقیع و دەوروبەر مێژووی رۆژانەی گەلەکەم هەوێن و مایەی چیرۆکەکانمن، بەڵام جۆری (گرح) کردنیان بەلامەوە گرنگە و مەرجیش نییە رووداوی چیرۆکێکم سەرانسەر دەق وەك چۆنە ڕوویدابێت، بەڵکو لەوانەیە

لەئەنجامی مۆنتاژ و کۆلاژی چەند رووداوێك و دیمەنێك و تێکەڵاوکردنی جێکات هاتبێتە کایەوە. زۆرجار چیرۆکەکانم لەژیانی خۆمەوە خواستووە و مەودایەکی بەرینم داوەتێ و کەسەکانم بە رێبازێکی ئەوتۆدا بردوون، کە لەوانەیە خۆم لەدوو رێیانی وادا هەندە ئازاو بلیمەت نەبم، یان سەرەتای چیرۆکێك لەبارەی کەسێکە و کۆتاییەکەی لە رووداوێکی ترەوەیە، یان خۆم تەواوم کردووە. بەنموونە: چیرۆکی (گەڕانەوە) کتومت (ع) عەبدوڵڵا سەڕاجە، کە روو لە شار دەکات، کەچی کۆتایی چیرۆکەکەم لە رووداوێکی ترەوە ساند، کە بەسەر کەسێکی دیکەدا هاتووە.

هەروەها چیرۆکی (شیوژاڵە) تۆمارێکی دەقاودەقی سەردەمێکی ژیانمە (کانی پڵنگان) و (٨½ بەیانی و...) و (برایم شۆراوی) خۆم و کەسانی دیکەن، کەچی چیرۆکی تریشم نووسیوە، نەخۆم دیومەو بیستوومە و نە رووی داوە -ئەی ناڵێن: نووسەر دروستکەری ئەو ژیانەیە، کە مەبەستییەتی- کەسانێك دێنێتە ناو، کە ڕەنگدانەوەی کەسەکانی ناو ناخین، یانیش گۆڕانێکی ئەوتۆ بەرپا دەکات، کە خەبات و کۆششی لەپێناو دەکات. بەلای منەوە ئەو نووسەرەی وەکو وێنەگر، گێلانە فۆتۆگراف دەگرێت، تەنیا و هەر دیمەنی دەرەوە نیشان دەدا، بەڵام گفتوگۆی ناخ و خەون و زیندە خەونی کەسانی ناو چیرۆکەکە وەکو شەپۆلێکی ئازاد لە وزەی ئەودا نییە راویان بکات.

چیرۆکەکانم سرکن، وەکو ماسیی زیوین بەگوێلی ئاو خۆیان بەدەستەوە نادەن، قەت نەمانژنەوتووە، ئەوەی لە مرواری بگەڕێت هەر لە رۆخی دەریاکاندا بخولێتەوە. خوێنەری ئازیز، ئەگەر لە چیرۆکێکم حاڵی نابێت با جارێك و دووان بیخوێنێتەوە وەك چۆن منیش شاکارە جیهانییەکان دەخوێنمەوە، یان چیرۆکم نییە سێ جارو پێنج جار و بگرە هەشت جار دامنەڕژتبێتەوە گومانیش لەوەدا نییە، بەو لەتە چاوەی خۆم، کە ماومە، دەیان ریشە دەماری لەشم جەڕ دەدەم. ئەی ناڵێن: وێژە سێسووچکەییە. ئیتر بۆ ئۆباڵی هەموو دەخرێتە ئەستۆی سووچکەیەك و.. دوو سووچکەکەی تر هەروەك مووی ناو ماست، لووس و باریك لێوەی دەرچن. مەبەستم لە رەخنەگرو خوێنەری سەدەی بیستەمە.

- ناوی هەندێ چیرۆکەکانت: (گەڕانەوە- بازنەکان- نەمام). ئەگەر بێت و هەریەکەیان بەچەند رستەیەك باس بکەیت، یان لێکیان بدەیتەوە، چۆنیان لێ کدەدەیتەوە؟

- گەڕانەوە: گەڕانەوەی کەسێکی شەیدا بۆ کۆشی خێزانەکەی، بەڵام تەلدڕێکی دەستکرد دەبێتە سنوور و هۆی شێواندنی شیرازەی ئەو یەکگرتنە کە پیرۆزەو ژن و منداڵ و مێرد چاوەڕوانی دیدارێکی دیکە بن.

بازنەکان: هەر شتێکی بازنەیی، هەر رووداوێکی بازنەیی و هەر ژانێکی بازنەیی خۆی رادەگرێت بەرانبەر بە رۆژگار. بازنە هێمای جوانی و مەزنی و نەمرییە.

نەمام: مرۆڤی هۆشمەند بە خاکەکەیەوە مرۆڤە، هەژ بەسەر ئەو گومڕایەی کە پشت لە مستێ خۆڵی وڵات دەکات. خاك، ئەوەندی بەسە کە نەمام دەڕوێنێ.

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# چیرۆك لای من هونەر و دەربڕین و گۆشە نیگا و هەڵبژاردنە



**دیمانە: سەربەست کەرکووکی**

**گۆڤاری پەیڤ، ژمارە ١٦**

عەبدوڵڵا سەڕاج یەکێك لە چیرۆکنووسە هەرە داهێنەرەکانی دنیای چیرۆکی کوردییە، لە سەرەتای حەفتاکانەوە کەوتۆتە ناو بواری چیرۆك نووسینەوە بۆ یەکەم جار لە گۆڤاری (رزگاری) لە ساڵی ١٩٧٠دا شانۆنامەی (کوورەی ئاسنگەر)ی بڵاوکردۆتەوە، یەکەم چیرۆکی لە (١٩٧٣)دا بەناونیشانی (راوە گورگ)لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری (بەیان) کەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانەوە، تا ئێستا ئەم کۆمەڵە چیرۆکانەی بە چاپ گەیاندووە (لاکێشە رووناکەکان- ١٩٨٠، مردوو خەون نابینێ- ١٩٨١، بارام ناوێك هەبوو- ١٩٨٢، پەڕەنگ-١٩٨٦).

چیرۆکنووس لەدوو دیداری گەورەی چیرۆکی کوردیدا خەڵاتی باشترین چیرۆکی وەرگرتووە، لە دیداری یەکەمدا لە (سەری رەش) بەسترابوو، بە چیرۆکی (هەشت و نیوی بەیانی، هەشت و نیوی شەو) بەشداری کردبوو، لە دیداری دووەمیشدا لە شاری هەولێر بەسترابوو بە چیرۆکی (برایم شۆڕاوی) بەشداری کردبوو، هەروەها رۆمانێکی سەرکەوتووی بەناونیشانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە) لەساڵی ١٩٩٠دا بڵاو کردۆتەوە. ئێستاش خەریکی تەواوکردنی رۆمانێکی نوێیە بە ناونیشانی (کاولاش) ئێمە، سەفەری کوردستانمان بە هەلێکی لەبار زانی بۆ ئەنجامدانی ئەم گفتوگۆیە.

- ئایا دەکرێت وەکو تاکێکی کۆمەڵایەتی خۆتان بە خوێنەران بناسێنێت؟

- ئەز لە کۆڵانی (سەیسەروەر)ی گەڕەکی (ئیمام قاسمی) کەرکووك لە ١٩٣٧دا چاوم هەڵهێناوە. سی ساڵ مامۆستاییم کردو ئێستا حەوت ساڵە کارکەنارم، پێش سێ ساڵ و نیو لە کەرکووك دەرپەڕێندرام و ئەمێستا لە هەولێری هۆلاکۆ بەزێندا نیشتەجێم، خوێندنی ئامادەییم تەواو کردووەو خولی پەروەردەییم دیتووە لەبەر چەند هۆیەك بۆم نەڕەخسا بچمە کۆلێژی (بازرگانی و ئابووری)ی ئەو سەردەمە، باوکم تارادەیەك رۆشنفکر بوو پێش ئەوەی کارەباو رادیۆ بگاتە کۆڵانەکەمان، ئەو لەبەر

چرایەکی نەوتیدا، حیکایەت و داستان و شانامەی بە تورکی بۆمان دەخوێندەوە و هەر شەوەش، خێزانیك و دووان لامان کۆ دەبوونەوە.

دایکیشم، هەرچەندە بێسەواد بوو، وەلێ لەویشەوە سەرچاوەم هەڵگرت کە بۆ ئەوەی قایل بم سەرم لە ئەسپێ و رشك پاك بکاتەوە، حیکایەتی بۆم دەگێڕایەوە لەو کاتانەی سەرم لەسەر ڕانی دادەنا، خۆم بە کەس و پاڵەوانی ئەو سەربردە ئەفسانەییانە دەزانی و ئاگام لە (جێکات) نەدەما. ئێستاش زۆر حەزم لەناو خەڵکی هەژار و بێسەوادو ساکارە، هەندەی برادەرم لەوانە هەن ئەوەندە ئاشنام لەناو رۆشنبیراندا نییە، زۆربەشیان نازانن، کە چیرۆکنووسم یان شیعر و چیرۆك لەیەکدی جیا ناکەنەوە. ئەز، ئەوانم خۆشدەوێ، زۆر دەخوێنمەوە بە جۆرێك ئەگەر گۆڤارێك یان نامیلکەیەك بەدەست کەسێکەوە دەبینم بەمن بێت هەر زوو لێی بخوازم و تینوویەتیمی پێ بشکێنم، ئەگەر بە پارە چنگم نەکەوت.

- مێژووی دەستپێکردنی نووسینی چیرۆك لەلای ئێوەدا کەی و چۆن بووە؟

- لە سەرەتای حەفتاکانەوە چیرۆکم نووسیوە. پێشتر چەند پارچە شیعرێکم لە هەندێ رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەدا بڵاوکردۆتەوە پێش ئەویش، بە عەرەبی دەمنووسی و کوردییەکەم دووکەڵی دەکرد. هۆی دەستپێکردنم بە زمانی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ هاندانی (عەلی باپیر ئاغا) ی شاعیر، کە هاوسێمان بوو لەو کۆڵانە تەنگ و ناهەموارەدا، پاشان هاوڕێی دڵسۆزم، هونەرمەند و شۆڕشگێڕ و پیاوی دڵپاك (خالید دلێر)یش فێری کردم چۆن بە پەتی بنووسم و کێش و سەرواو رەزم و بڕگەی شیعریی ئەوسا چۆن بووە، لە سەرەتای حەفتاکاندا هاوتەریب لەگەڵ (ڕوانگە)دا، ئێمەی نووسەرانی کەرکووك جڵەوی تازەگەرێتی و پێشەنگایەتی و ژانە هونەرییەکانمان گرتە ئەستۆ. سەرچاوەی خوێندنمان بەعەرەبی بوو، ئەز کەم و کورتێك بەتورکیی لاتینی و ئینگلیزیشم دەخوێندەوە لەپاڵ چیرۆکنووسیندا، کە یەکجارەکی وازم لە شیعر هێنا، هەندێ وتاری شێوەکاریم دەنووسی.

- یەکەم چیرۆکتان بە ناونیشانی چی و کەی و لە کوێ بڵاوکراوەتەوە؟

- یەکەم چیرۆکم (راوە گورگ) لە ئاداری (١٩٧٠)دا نووسیوە و لە ژمارە (٩)ی گۆڤاری (بەیان)ی ساڵی ١٩٧٣ بڵاوکراوەتەوە، لەمەڕ منداڵێکەوەیە، چاوەڕوانی باوکی دەکات بگەڕێتەوە، دایکی دەزانێ شەهید بووە و کۆرپەکەی ئاگادار نەکردووەتەوە.

- تا ئێستا چەند کۆمەڵە چیرۆکتان بە چاپ گەیاندووە و کامیان بە سەرکەوتووترینیان دەزانی؟

- کۆ چیرۆك، بۆ زاراوەی کۆمەڵە چیرۆك بەکاردێنم، چوار کۆ چیرۆکم بەچاپ گەیاندووە: ١- لاکێشە رووناکەکان ١٩٨٠، ٢- مردوو خەون نابینی ١٩٨١، ٣- بارام ناوێك هەبوو ١٩٨٢، ٤- پەڕەنگ ١٩٨٦، هەرچەندە کۆچیرۆکی پێنجەمم (پەیك) لە ١٩٨٨دا ئامادە کرد، بەڵام لایەنێك نەبوو بە هانامەوە بێت.

گشت چیرۆکەکانم وەکو پەڕی دڵمن، وەلێ ئەو کۆچیرۆکەم زۆر خۆشدەوێ، کە بڵاوم نەکردۆتەوە هەرکە بەرهەمێکم بەچاپ گەیشت ئیتر دەستی لێ دەشۆم و دەکەومە مشووری تازەوە. دەشتوانم بڵێم فلانە چیرۆك پتر ئەزموون و ئازاری خۆمی پێوەیە، یان کەسی سەرەکی خۆمم، تەنانەت برادەران و لە شارانی دیکەش نامەی خۆشنوودییان بۆ ناردووم لەمەر چیرۆکێکمەوە، بەهەرحاڵ من رێز لە هەموو بۆچوونێك دەگرم، بێگومان سەرکەوتنی چیرۆك بەندە بە شێوازی داڕشتن و تەکنیك و.....تاد، چیرۆك لەلای من هونەری گوتن و دەربڕین و گۆشەنیگا و هەڵبژاردنەکەیە، دەنا گوتار دەنووسم، یان حیکایەت دەگێڕمەوە، لە دیداری یەکەمی چیرۆکی کوردی لە (سەری رەش) و لە دیداری دووهەمیش لە هەولێردا، بەڕای گوێگران و رەخنەگران و پسپۆران چیرۆکەکانم

چیرۆکی هەرە دیار و سەرکەوتووی ئەو دوو دیدارە هەتیوە بوون. لە یەکەمینیاندا چیرۆکی (هەشت و نیوی بەیانی و هەشت نیوی شەو) لە دووەمیندا چیرۆکی (برایم شۆڕاوی)م خوێندەوە، هەروەها لە ڕۆژنامەو گۆڤار و ئیزگەیشدا زۆریان لەسەر گوترا. لەکۆڕێکی هەولێریشدا چیرۆکی (پەین)م خوێندەوەو زۆر پەسەند کرا.

- بەڕای من یەکێ لە چیرۆکە هەرە سەرکەوتووەکانی ساڵانی پێشووتان، چیرۆکی (کلیل)ە، ئایا ئەم چیرۆکە هیچ بیرەوەرییەکی بۆ ئێوە جێهێشتووە؟

- وەکو گوتم هەر خوێنەر و رایەك لەبارەی سەرنج و گۆشەنیگای خۆیەوە ئاماژە بۆ چیرۆکێك دەکات، وەکو بەڕێزتان (کلیل)تان دەستنیشان کردووەو باشیش پێکاوتانە: چونکە کلیل سەربردەیەکی سەیری هەیە و لە بابەتێکی ناسك دەدوێ.

کەسانی دیش ئەمەیان پێ گوتووم. ئەم چیرۆکە لە شوباتی ١٩٧٣دا نووسیومە و لە ژمارە (٣١٩)ی هەفتەنامەی (هاوکاری)ی ١٩٧٦/٧/٢٥دا و هەم لە کۆچیرۆکی (بارام ناوێك هەبوو)ش هاتۆتە بلاوکردن. ئەوەی راستی بێ لەژێر ناوی (پشکنین)دا بوو کە دامە (مستەفا نەریمان) بۆ بلاوکردنەوەی لە (بەیان)دا، بەلام پاش ماوەیەکی دوورو درێژ، گوم بوو. ئەوسا نەریمان گوتی: مادام چیرۆکەکە بەناوی پشکنینەوەیە، دەبێ بە دوایدا بگەڕێین و بپشکنین. ناچار بووم، جارێکی دیکە ناردم و بلاویان کردەوە. ناوەڕۆکی چیرۆکەکە زۆر ساکارە، بەلام بە قووڵی لە مەسەلەیەکی گرنگ دەدوێ. کابرایەك کلیلێکی بزر کردووە. ئەم و ئەو، لە خۆیانەوە، لەگەڵیدا بۆ کلیلە ونبووەکە دەگەڕێن، هەر یەکەو بە نیازێك و بەبێ ئەوەی بزانن لە چی دەگەڕێن، پاشان، کە دەزانن ونبووەکە کلیلێکی بچووکی ژەنگنە، سەرسام دەبن، گاڵتەی پێدەکەن، دوور دەکەونەوە. ئەویش دەڵێ: هەرچەندە لەلای ئێوە بێ نرخە، بەلام لای من وانییە، چونکە کلیلی ئەو سندووقەیە، کە ناسنامەی خۆم و خێزانەکەمی تێدایە، کێ لەم وڵاتەدا بەبێ ناسنامە دەتوانێ بسووڕێتەوە؟ ئەمە تەنیا ناوەڕۆکی بوو. دارشتنەکەی دەبێ وێنە و چێژی لێ وەربگیرێ، ئەم چیرۆکە بەسەر خۆمدا هاتووە.

-ئێوە لە زووەوە دەستی وێنەکێشان و هونەری تەشکیلی و دراماتان هەبووە. زانیارییەکی باشتان لەم بوارانەدا هەیە، ئایا ئەم بابەتانە چەندێ ڕۆڵ و کاریگەرییان هەبووە لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکانتانا؟

- پێش ئەوەی یەکەم چیرۆك بنووسم، شانۆنامەی (کوورەی ئاسنگەر)م لە ۱۹۷۰دا لە ژمارەکانی (۱۱-۱۲-۱۳)ی گۆڤاری (رزگاری)دا بڵاوکردەوە. لەبارەی هونەری شێوەکاریش پتر لە سی گوتارم لە (هاوکاری)دا بڵاوکردەوە لەژێر ناوی (با لە هونەر بگەین) لە ژمارە ١٥٤ی ساڵی ۱۹۷۳وە بۆ ژمارە ۲۰۸ی ئاداری ۱۹۷٤. خوا ئەوانە بگرێ، کە بوونە سەبەبکاری وازهێنانم، ئەو کەسە (د. حەمید عەزیز) بوو، دەنا نیازم بوو نزیکەی شەست حەفتا گوتار بنوویم هەتا دەگاتە شێوەکاری لەلای کوردان، تەنانەت چوار بەشی ئامادەشم هەبوو، دڕاندمن. ئەوەش دەڵێم، کە ئەوسا پاداشت بۆ نووسین نەدەدرا. زمانی شێوەکاری و شانۆ لە چیرۆکەکانمدا رەنگیان داوەتەوە. رەخنەگران پەنجە نۆمایان بۆ کردووە. رەخنەگری لاو (زایەر رۆژبەیانی) لە کتێبێکی رەخنەییدا، کە بۆیان بڵاو نەکردەوە، بە وردی ئاماژە بۆ ئەم لایەنە دەکات و بەراوردێك لەنێوان ئەوانەی من و نموونەکانی (کلۆد سیمۆن) دەکات، کە بەهۆی ئەوەوە (نۆبڵ)ی پێ بەخشرا. بگرە من شتی دیکەم کردووە لای ئەو نییە بەبێ ئەوەی بەرهەمی ئەوم دیبێ و تەنانەت هەتاکو ئێستاش تەنیا یەك رۆمانی کراوە بە عارەبی. بەڵێ شێوەکاری و بە وشە کەڤاڵ رەنگاندن، خوێن و پێزیان بە چیرۆکەکانم داوە. ئەمە بێجگە لەوەی چیرۆکم هەیە بابەتەکەی لەسەر هونەر و را و بۆچوونی خودی خۆم لەمەڕ ئێستێتیك و رەنگ و شکڵە (هەندسی)یەکان دەربڕیوە، بەداخەوە، هەتاکو ئێستاش رەخنەگرێك درکی بەوە نەکردووە. لێرەدا ناوی چەند چیرۆکێك دەبەم (بازنەکان- پەیکەر- بە خەڵووزیش نیگار دەکێشرێت. ئاپۆ جوامێر لە پێشانگای چاواندا- فانتازیا و تابلۆیەکی کێوی) ئەمە بێجگە لەوەی، کە چەند وتارێکم نووسیوە، کە لە رووی تەشکیلییەوە باسم لە شیعر و چیرۆك کردووە، کە نموونەیان

نییه، وەکو: ١-نیگارو وێنە لە (بازنە)کەی کاکەمەم بۆتانیدا، گۆڤاری (رۆژی کوردستان) ژمارە (٥٧)ی ١٩٧٩. ٢-میهرەجانی رەنگ و هێڵ لە پێشانگای نالیدا، گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) ژمارە ٦٨ و هی دیکەش.

ئەز، خۆم بە نیگارکێشی وشە دەزانم، بە پەیڤ سکێچ و کەڤاڵی جۆراوجۆری ناخی دەکێشم، ئەگەر بۆشم بلوێ لە مۆسیقاش وەردەگرم. لە ساڵی ١٩٥٢ کە قوتابیی دواناوەندی بووم میدالیای (رەشید نەجیب)م وەرگرت، کە ئەوسا (متصرف)ی کەرکووك بوو، لەسەر نیگاری (غاندی) کە پۆرترێتێکی مەرەکەبی چینی بوو، هەروەها ئەندامێکی چالاکی لیژنەی نیگار و پۆستەر بووم لەگەڵ مامۆستاکەماندا (مەحموود ئەلعوبەیدی) و وەکو ئینتیباعییەکان Expressionism دەچووینە (چوارباخ) نیگارمان لە سروشتەوە دەکێشا. من، بە (رەنگبۆیە) و ئەو بە (رۆنبۆیە) ئیشمان دەکرد.

- ئایا مەسەلەی نەتەوایەتی چۆن لە چیرۆکەکانتا رەنگی داوەتەوە؟

- مەگەر بە دەگمەن، دەنا چیرۆکەکانم (نەتەوایەتی-چینایەتی)یان لە ئامێز گرتووە، بەڵام من حەزم لە تیۆراندن (تنظیر) و راستەوخۆیی و دروشم هەڵبڕین نییە. ئەمن، خۆم لە نووسەرانی دیکە بەوەدا جودا دەکەمەوە، کە (نەتەوایەتی)م پێش (چینایەتی) خستووە. بێگومان ئەزموون و ژیان و رووداوەکانی ئەم دوایییە دروستیی ئەم رێبازەی سەلماند. هەرچۆنێ بێ، ئەز سیاسی نیم و حەزیش ناکەم بەرهەمەکانم بە پێوەر و بێژنگی رامیاری هەڵسەنگێندرێ. ئەمە مانای ئەوە نییە، کە لە پۆلەتیك خۆم دەبوێرم، نا" بەڵکو نیازمە.. نووسەری گەلەکەم بم.. نەك نووسەری چین و پارت و رێکخراوەیەك. نامەوێ ببمە زورنای هیچ لایەك. ئەز، تەپڵ ئەنگێوی ماف خوراوانم لە هەر جێگەیەك بن. بەلای منەوە، ئەدیب و هونەرمەند هەتا هەتایە نەمرن، کەچی رامیاران و لایەنەکان کاتین. ماوە بڵێم: ئێجگار زۆر لە پۆلەتیکەوە نزیکم بەو

واتایەی، کە (متابعە) دەکەم و دەخوێنمەوەو گوێ لە رادیۆکان دەگرم، بۆ ئەوەی لە شتە نهێنی و گەمەکانی نێو دەوڵەتان بگەم.

- ئایا ئێوە قۆناغەکانی سەرهەڵدان و نەشونماکردن و نوێبوونەوەی چیرۆکی کوردیمان چۆن جیادەکەنەوە؟

- لەسەر ئەم خاڵە زۆر نووسراوە. بەهەر حاڵ حەفتا ساڵ پترە چیرۆکی کوردی لە دایك بووەو نەشونما دەکات. بەلای منەوە، لە سەردەمی (گەلاوێژ)دا چیرۆك هونەری بوو، بەڵام لە سەرەتای حەفتاکاندا، چیرۆك لە قاوغە کۆنەکەی راپەڕی و بە گوڕ و سەربڵندانە هاتە ناو، تەنانەت شۆڕە سوارانی سەردەمی پەنجاکان و شەستەکان دانیان بەمەدا ناوەو (محەمەد مەولوود مەم) بە خۆمی گوت، کە پاش ئەو هەڵگری ئاڵای چیرۆکم و وابزانم لە یاداشتەکانیدا ئەوەی تۆمار کردووە، هەروەها (محەرەم محەمەد ئەمین)ی خوالێخۆشبوو ئەمەی درکاندووە لە ژمارە ٢٣٩ی (الفکر الجدید)ی مایسی ١٩٧٧دا دەڵێ: (اڒا أمعّنا النڤر فی القصص الکوردیە القصیرە للستینات، نری بأن اغلبها کتُبت علی الگریقە السردیە واستعملت فیها الخگبە الحماسیە والمحادپە والوعڤ، هڒە السِّمات وغیرها جعلتها غیر ناجحە علی صعید الڒوق والحسّ الادبی، وبالرغم من ما ڒکر، هناك قصص قصیرە ڤهرت فی السنوات الآخیرە ناجحە و تلفتُ الانتباە من حیپ الشکل والمحتوی کقصص عبدالله السرّاج، مەم (کاکە مەم بۆتانی) حسین عارف وحسن قزڵجی... حاول القصاصون فی السبعینات تجنب السرد فی کتابە القصە واستعمال المونولوج والاهتمام بعنصر الوقت...) ئەم پەڕەگرافەم بۆیە هێناوە، چونکە گرنگە و کاتی خۆیشی فەرامۆشیان کردبوو لە چاوپێکەوتنێکمدا لە گۆڤاری (رەنگین) کەواتە چیرۆکی کوردی دەکەمە سێ قۆناغ:

١- قۆناغی سەرەتا و نەشونماکردن.

٢- قۆناغی گەلاوێژ هەتاکو شەستەکان.

٣- قۆناغی حەفتاکان و هەتاکو ئێستاکە. هەرچەندە ئەم تخووبە ئاسندڕك نییە و دەشێ کەم و کورتی و تێکەڵاوی و شەوازی تێدا بێت، هەروەکو چۆن لە هەر

قۆناغێکیشدا، پلەی جیاوازیی هونەری و رچە ڕێگەی شکێندراو بەدی دەکرێ. ڕاستییەکەی زوڵمە وا بە کورتی باس لە مێژووی پڕ شانازیی چیرۆك بکەم.

- وەك یەکێ لەوانەی ڕۆڵێکی گرنگتان لە تازەکردنەوەی چیرۆکی کوردیدا گێڕاوە، چۆن سەرنجی پەیڤی نوێ دەدەن و چ مامەڵەیەك لەگەڵ تەکنیکی نوێی چیرۆکدا دەکەن؟ هەر لە چوارچێوەی ئەم پرسیارەدا، ئایا چۆن تەماشای چیرۆکی سەرکەوتووی بێ داهێنانی نوێ دەکەن؟

- لە سەرەتای حەفتاکاندا، ئێمەی چیرۆکنووس، بێ رابەر و بێ مامۆستا بووین، تەنیا خوێن گەرمی و دڵسۆزی و خەلفیەتی رۆشنبیریی عەرەبیمان هانی دەداین. هەنگاومان بۆ خۆ قوتارکردن لە قاڵبە سواوەکان و گیان بەخشین بە وشە و دەستەواژە و وێنەکان بوو، بۆ ئەوەی پتر برِ بکەن و لە واتا قامووسی و ئاساییەکانیان، مەودای بەرینتر و قووڵتر ببڕن. ئەز، بەش بە حاڵی خۆم، هەنگاوی چاکم لەمەدا ناوەو هەمیشە ئاسایی و باوانە نەمنووسیوە، هیچ کاتێك نووسینم نەکردووە بە ساندویچ و خۆراکی کاتیی خوێنەر، بەڵکو ویستوومە لەگەڵیدا بەشداری بکەم و ئەویش ئاوێتەی داهێنان و جوانکارییەکان ببێ. نیازم وابووە. ئەویش بیربکاتەوە، رابمێنێ، هەڵوێست هەڵبگرێ و خۆی بەمن بزانێ. بۆ یەکەم جاریش لە چیرۆکەکانمدا قسەم لەگەڵ خوێنەر کردووەو (برێخت)انە مامەڵەم لەگەڵدا کردووە. رستەم بە ناتەواوی داوەتێ بۆ ئەوەی پڕی بکاتەوە، یان دێری نێوان دێرەکان و بێدەنگییەکان بخوێنێتەوە. ئەمانە و شتەکانی دیکە، کاری رەخنەگرن و من بە چاکی ناتوانم لێوەیان بدوێم. من، هەمیشە بۆخۆم دەنووسم و تەعبیر لە ناخی پەنگاوەی خۆم دەکەم و حەزیش دەکەم، کەسانی تر وەکو من بیر بکەنەوە، چێژ وەربگرن و لە دوو رێیانەکاندا بەرپرسیاری هەڵبژاردنبن و ئەز، دانابەزمە ئاستی نزم، گوایە نیمچە خوێندەوار رازی بکەم، بەڵکو دەمەوێ پەلی رابکێشم و بڵندی بکەمەوە. لە حەفتاکاندا، خوێنەرانم کەم بوون، بەڵام ئەمرِۆ زۆرن و لەوانەشە داوای پتر داهێنان بکەن. هیوام بەهێزە، کە لاوان پەرە بە هەنگاوەکانمان

بدەن و ئێمەش تێپەڕێنن. خۆ ئەوان لە بارودۆخێکی گونجاوترن و سەرچاوەی زۆر و تاقیکردنەوەی ئێمەیان لە پێشدایە، بەڵام بە داخەوە دەڵێم، نەوەی نوێ (مەبەستم لە بەرهەمی بڵاوکراوە) هەر لە سێبەری حەفتاکاندان. چیرۆکی سەرکەوتوو، ناسنامەی خۆی پێیە، لێ چیرۆك بۆقێك نییە لەم سەردەمەدا، ئێسك، گۆشت، پێست و ماسوولکەکانی لە یەکتری جیابکەینەوە. خۆ مەرجیش نییە، تاکە چیرۆکێك گشت تەکنیکەکانی تێدا بێت. بە کورتی و بە گشتی، وەك چۆن جلوبەرگ و پۆشاکی مرۆی ئەمڕۆ لە پۆشاکی پێشوو ناکا، چیرۆکیش وایە. دەبزانە لە سادەکردنەوەی وێنە و چواندنەکان، بە جلوبەرگ. ناگەمە ئەو نیازەی دەمهەوێ. مەسەلەی هونەری گیانێکە راڤە ناکرێ.

- ئەگەر بکرێ، بەراوردێك لە نێوان چیرۆکی کوردی و هی نەتەوەکانی تر بکەین، ئایا ئێوە چۆن دەڕواننە ئەم بەراوردکردنە و لە بواری جیهانیدا چیرۆکی کوردی لە چ ئاست و خانەیەکدا دەبینیتەوە؟

- پێشەکی، لەگەڵ ئەو پێوەرەدا نیم، کە بۆ ئاستی جیهانیبوون دادەنرێ. ئاستی جیهانی یەعنی چی؟ ئەز، ئەوە دەزانم، چیرۆکی هونەری و سەرکەوتوو هەیە و چیرۆکی ئاسایی و لاواز هەیە. جا لێرە بێ یان لەوێ. شیعر و چیرۆك و رۆمانی خۆمان و بیانیش هەن داهێنانیان تێدایە، بە پێچەوانەشمان دیوە. جا رێژەکە بەم جۆرە بێت چاکتر و زانستییانەترە: چیرۆکی باشی ئێمە دەگاتە ئاستی باشی هەندەران و دەورو دراوسێکانمان. بەر لە هەموو شتێك دەبێ، ئەو گرێ کۆنە خۆ بە کەمزانینە لە ناخماندا بقرتێنین، بەڵێ چیرۆکمان هەیە، کە لە روومان بێ بەراوردیان بکەین لەگەڵ چیرۆکی سەرکەوتووی جیهانیدا، کە لەباری تەکنۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و.....تاد، ئێمەیان تێپەڕاندووە. ئێرە جێگایەکی شیاوە کە بڵێم: هونەر و ئەدەب زۆر پەیوەست نین بە سنووری سیاسی و (کیان) و پیشەسازی و ژیارییەوە. فەرموون ئەمیش ئەدەبی زەریای کاریبی و ئەفریقیا و شوێنانی دیکە. ئەمیش نالی و گۆران و محەمەد مەولوود مەم و

لەتیف حامید و حوسێن عارف و حەسەن قزڵجی و محەمەد موکری و سەلاح شوان و مەحوی و کێ و کێ... بە وێنە: بەندە، چیرۆکی بیانی و رۆمانی ئەوتۆم خوێندۆتەوە، کە ئاستیان نزم بووەو زۆریش ئاسایی بوون. نموونەی چاکی خۆماڵیشمان گۆڕدراونەتە سەر زمانەکانی ئەوروپا و مایەی شانازی بوون. هیچ بەرەوای نازانم، کە رۆمانێك تازە لەلامان چەکەرەی کردووە بەراورد بکرێت لەگەڵ شاکارێکی ئێجگار مەزنی جیهانی. خۆ من، لەوە لاری نیم، کە ئاواتمان هەبێ، بەڵام با سەرەتاکانی ئەوان و سەرەتاکانی ئێمە بگرینە بەرچاو، ئەوسا خاڵی درەوشاوەمان دەبینین. باشە، برادەرانی دەرەوەی وڵات، گەلی برادەرینە، کەمێك مەچەکی لێ هەڵماڵن و لایەك لە ئەدەبی کوردی بکەنەوەو نموونە باشەکانی وەرگێڕنە سەر زمانەکان، خۆ کەعبە کەچ نابێ. ئەو کارە مێژوویی و نەتەوایەتی و پیرۆزە ئەنجام بدەن.

- ئایا هێڵی دووەمی ئەدەب، واتە چیرۆك لە ئاست شیعری کوردیدا دەبینن؟ ئەگەر نا، هۆیەکانی نەگەیشتنی ئاستی جەماوەریی چیرۆك بە ئاست و رادەی پەرەسەندوویی شیعری کوردی لەچیدا دەبینن؟

- سروشتی شیعر وایە، لەگەڵ ئاستی جەماوەری، زوو دەگونجێ و پتر توانای رووبەڕووبوونەوەی هەیە، بۆیە لە کۆڕ و فیستیڤاڵەکاندا ئامادەیی خۆی دەسەلمێنێ، چونکە بڕگەکانی کورتە و پشت بە مۆسیقا و رەزم دەبەستێ. لەلایەکی دیکەوە، دەمێکە رەگی لە هۆش و هەست و بنهەستی خەڵکدا داکوتاوە، بێجگە لەوەش، شیعر خۆی لە خۆیدا هونەری گوێیە بە پێچەوانەی چیرۆك، کە هونەری چاو (خوێندنەوە) و تاکە، بۆیە شیعر بە زوویی دێتە دەست و گورجیش بەشداریی گۆڕانکارییە جۆراوجۆرەکان دەکات. ئەو هۆیانە و چەندینی دیکە، شیعری لە جەماوەر نزیك کردۆتەوە. ئەوەیش لە یاد ناکەین، ئێمە تازە لە ژیانی سیستەمی هۆزایەتی بەرەو ژیاری و شارنشینی دەڕۆین، بۆیەش گوتراوە، کە چیرۆك و رۆمان زادەی هونەری شارستانێتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە تێکەڵاوە ئاڵۆزەکانن. ئەگەر شیعر ختووکەی

گویٚ بدا، ئەوا چیرۆك ختووكەی چاو دەدات، چونكە جاری وا هەیە، شێوەی وشەكان و دارِشتن و شكاندن و بنیاتنانەوەی رستە، خۆی لە خۆیدا جوانكاری و چێژ بە چاو دەدات، دیسان ئەم خالاٚنەیش، ئەركی رەخنەگرانە، بەلاٚم بۆم هەیە بلێٚم: ئەدەبی نویٚ، رەخنەگری بنیاتنەری نوێی دەویٚ، هەروەها، گوێگر و خوێنەری نوێباویشیان گەرەكە. ئەوەش لەبیر نەكەین، چیرۆك -وەكو بابەتێكی نۆژەن لە ئەوروپاوە هاتبیٚ- تەمەنی كورتە، هەرچەندەش رەگ و ریشەی لە حەكایەتی بەرگوێی ئاگردان و داستان و ئەفسانەكانماندا دەدۆزینەوە. چیرۆكیش جەماوەری خۆی هەیە و رۆژ لە دوای رۆژ لە پەرەسەندنە. لەم بیست سالەٚی دواییدا، چیرۆك، رەوتی چاكی هەبووەو زۆر لە شاعیر و جەماوەری بۆ لای خۆی راكێشاوە. ئەز، نەمژنەوتووە چیرۆكنووس بگەرِێتەوە بۆ شیعر نووسین، بەلاٚم شاعیران هەن رووەو چیرۆك چوون، ئەمەیش دیاردەیەكی ئەدەبییەو.. دەشیٚ لێی وردبینەوە. دواجار، خۆ ململانیٚ لەنێوان شیعر و چیرۆكدا نییە، بەلكٚو بە جووتە بالەٚكەی ئەدەبی دەزانم. ئەمە هەمووی لەبەر كزی و دەنگی نزمی رەخنەیە، دەنا كەی پیشەی منە. راستیت دەویٚ، خۆم بە باشی ناتوانم پارێزگاری لە چیرۆكەكانم بكەم و كەسانی وا هەن لە خۆم كارامەتر پەنجەیان بۆ راكێشاوە، ئەوە ماوە، بلێٚم: ئەوكاتە چیرۆك بە پێز دەبیٚ، كە بە زمانی خەستی شیعر نووسرابێت، خۆ شیعریش وا خەریكە لە چیرۆك و رۆمان نزیك دەبێتەوە، نموونەش زۆرە. ئەمرِۆ رۆژی دەست لە ملكردنی گشت هونەرەكانە لە رۆژئاوایش، هونەری شیعر و هونەری چیرۆك و... كەواتە (هونەری)یەكە مەبەستە. بەشبەحالیٚ خۆم تەنیا لە دوو دیداری چیرۆكدا و سیٚ جار چیرۆكم خوێندۆتەوە هەرگیز حەز بە رووناكی و تەلەفزیۆن ناكەم، چونكە بە هیچ شێوەیەك چیرۆك هونەری خوێندنەوە نییە. ئەی ئەگەر نووسەرەكەش دەنگی زولاٚلیٚ نەبوو. ئەی چۆن حیوارەكان بخوێنێتەوە؟ ئەی تەداعی و تەوژمی هۆشەكان، چۆن دەربرِیٚ؟ دەبیٚ ئەوسا ببێتە ئەكتەرێكی شانۆ بۆ ئەوەی هونەرەكەی بگەیەنیٚ. لە دیداری یەكەمینی چیرۆكدا، هونەرمەندی شانۆكار (تەلعەت سامان) گوتی: زۆر

سەرکەوتوو بوویت، چونکە خۆڕسکانە و بەشێوەی نواندن، وشەکانت دەردەبڕی، بەڵام من خۆم هەستم بەوە نەکرد، دیارە ورووژابووم.

- هیچ هەوڵێکی داهێنانی ڕۆمانتان هەبووە؟ یان چۆن؟

- ڕۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە) لە ١٩٧٩-١٩٨٤دا نووسیوەو دامە دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، کەچی لە ١٩٩٠ کەوتە بازاڕەوە. ئێستاش ڕۆمانی (کاولاش)م لە ١٩٨٦-١٩٨٩ نووسیوە و چاوەڕوانی هیممەتی ڕۆمان پەروەرێکم. ڕێکخراوێك بێ، یان پارتێکی سیاسی. کاروباری چاپەمەنی زۆر زۆر دژوار و گران بووە، کە لە توانای کەسدا نەماوە، پڕۆژەی ڕۆمانی سێیەمم داناوە، هەتاکو ئێستاکە سێ بەشم لێ نووسیوە لەژێر ناوی (ڕاز)دا، ڕۆمانی (کاولاش)م زۆر خۆشدەوێ، چونکە بێجگە لە ناوەڕۆکەکەی (شەستەکان و دوو بەرەکییەکەی) تازەترین تەکنیکی هونەری و پاراسایکۆلۆژی تێدا بەکارهاتووە. بۆچوونی خۆم لەمەڕ کەون و هونەر و مردن و زۆر شتی میتافیزیکی دەربڕیوە. پەنجەم بۆ زامەکان ڕاکێشاوە و لە هیچ لایەنێك و حزبێك سڵم نەکردۆتەوە. ئەی من، لە کوردستانی ئازاددا بڵاوی نەکەمەوە، ئەدی لەکوێ؟

- بۆچوونت بەرانبەر ئەم ناوانە چییە؟

-ئیحسان مستەفا:

-پێشڕەوی نوێخوازییە لە چیرۆکی کوردیدا، بەڵام کەمبەرهەمە. بەردەوام نەبوونی بۆشاییەکی کاریگەری خستە نەخشەی چیرۆکی نوێی کوردییەوە.

- کاووس قەفتان:

- زمانی زیندووی دەزانی، بەڵام نەیتوانی سوودیان لێ وەربگرێت، چیرۆکی ڕاوەبەرانی جوانبوو.

- مارف خەزنەدار:

چیرۆکنووسێکی تەکنیککار و هونەرییە، بەداخەوە ئەوەندەی لە لایەنی نووسینی ئەکادیمییەوە بایەخی پێدەدرێت، هێندە کارە داهێندراوەکانی ناخرێنە ناو هەڵسەنگاندنەوە. ئەمەش ناهاوسەنگی ناوەندی ئەدەبی کوردییە.

- کاکەمەم بۆتانی:

- نەبووە سیاسییەکی سەرکەوتوو، نەبووە چیرۆکنووسێکی سەرکەوتوو، بەڵام بۆ گوزەرانی سوودی لە هەردووکیان وەرگرتووە.

- ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل:

- چیرۆکەکانی واقیع تێپەڕ ناکەن، داڕشتن و زمانیشی لاوازە.

- ڕەووف حەسەن:

- زیاتر ڕەخنەگرە لەوەی چیرۆکنووسێکی داهێنەر بێت.

-سەلاح شوان:

- ئەگەر خۆی بۆ چیرۆك تەرخانبکردبوایە چیرۆکنووسێکی بلیمەت دەبوو. ئەو کەمە بەرهەمەی، کە هەشیتی سەرکەوتوون.

- محەمەد فەریق حەسەن:

- لەڕووی هونەرییەوە کەم پێشکەوت، یەکەم چیرۆك و دواچیرۆکی جیاوازییەکی هونەری ئەوتۆیان لە نێواندا نییە.

- غەفوور ساڵح عەبدوڵڵا:

- لەلایەنی فیکریی و هونەرییەوە بەهێزە، بەڵام لەلایەنی داڕشتنی زمانیەوە لاوازە.

- ڕەووف بێگەرد:

- چیرۆکنووسێکی سەرکەوتووەو توانی ئەزموونی خۆی لەڕووی زمان و داڕشتن و شێوازەوە دەوڵەمەند بکات.

- مستەفا ساڵح کەریم:

- چیرۆکنووسێکی واقیعی سەرکەوتووە، چیرۆکی (پیرەمامند)ی چیرۆکێکی نایابە.

- سەدرەدین عارف:

- سەدرەدین عارف و لەتیف حامید و ئەحمەد شاکەلی و بۆ سەرەتای نوێخوازی چیرۆکی کوردی گرینگ بوون.

- جەلیل کاکەوەیس:

-چیرۆکنووسێکی داهێنەرە. شێواز و زمانی تۆکمەیە.

-ئەحلام مەنسوور:

کۆ چیرۆکی (پرد)ی جوانبوو. دوای ئەوی هیچ بەرهەمێکی تری سەرنجی ڕانەکێشاوم.

جەبار جەمال غەریب:

- زمانێکی ڕۆمانسیی وەسفی هەیە. لە دەربڕینشدا واقیع بە شێوەیەکی فەنتازی و وەسفی پشاندەدات، سوودیشی لە ئەفسوونی جادوویی وەرگرتووە، داهێنانی تێدا بەرجەستە کردووە.

- لاتان ئاشکرایە، کە مندالّدانی ئەدەبی کوردی تاکو ئەم ساڵانەی پێشووش نەیتوانیوە هەڵگری بابەتی رۆمان بێ، ئایا هۆیە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکانی ئەم دیاردەیە لە چیدا دەبینن؟

- بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رامیاری و.. و.. کورد هەڵگری رۆمان بووە، ئەی نەتەوە نییە. نەچەوسێندراوەتەوە؟ وڵاتی دابەش نەکراوە. هەست بە رەگەز پەرستیی دەوروبەری ناکات؟ ئاواتی دێرینی نییە بۆ سەرفرازی و دیموکراسی و ژیانی بەختەوەرانەی دوور لە ستەم و گوشار و تیرۆر؟ کێشەی ئابووریی نییە؟ ئەوی کەمتەرخەم بوو، ئەوی نەیدەوێراو زاتی نەدەکرد و خۆی بە کەم دەزانی، خودی

نووسەرانمان بوون، بەخۆشمەوە. هەریەکەمان چاوەڕوانی یەکێکی دیکە بوو بۆ ئەوەی بەستەڵەکەکە بشکێنێ و ملی تووله ڕێگەی هات و نەهات بگرێ. لە یادمە، پێش هەشتاکان، (مەحموود زامدار) کە تەوەری ڕۆشنبیریی ئەوسای گڕ دەدا، گوتی: تۆ هەڵبژێردراوی، کە ڕۆمانی نوێی کوردی بنووسیت. خۆم گێل کرد و پرسیم: بۆ؟ گوتییەوە: چونکە لە کەرکووك دادەنیشی. دەسبەجێ زانیم، مەبەستی ئەوەیە، ڕۆمان هونەر و دیاردەیەکی شارستانییە و زادەی شارە زلەکانە. دڵنیام کرد، کە دەستم داوەتێ و چەند پارێکیشم نووسیوە. هەربۆیە لە ڕۆمانی (کاولاش)دا، تەحەددا و رووبەڕووی ئەوە بووم، کە ڕۆمان زادەی شارە، گشت ڕووداوەکان لە گوندێکی سی ماڵیدا و کردوومە بە هێمای گشت کوردستان، گوندەکەش (چیمەن)ە، کە لە ڕۆژێکدا نەوەد کەسیان لێ دەسڕێژ کردن. کەسایەتیی سەرەکیش ناوی (چیمەن)ە، واتە: کەس و جێگە، ئاڵوگۆڕکێ دەکەن. بێجگە لەوەش، لە ڕۆمانەکەدا، بابەتی رەخنەم نیشان داوە، وەك ئەوەی رەخنەی تێدایە، کە دیاردەیەکی (میتارۆمانە)، رەخنەکان لە هەمینگوای و دیکارت و.....تاد، لێرەشدا، دەمی پرسیار دەکەمە دەوڵەمەند و دۆستانی وشەی گەشی کوردی: ئەی بۆ ئێوەمانان ئەو کارە ناگرنە ئەستۆ؟ خۆ رەنگە قازانجی ماددی و مەعنەویشی بۆتان هەبێ.

- گومان لەوەدا نییە، کە رەفتارەکانی دیکتاتۆرییەت، تاکە حیزبی و هەڵسوکەوتی فاشیستییانە هۆی سەرەکیی دواکەوتنی هونەر و ئەدەب بەگشتی بن، ئایا بەڕای ئێوە، ئەو رەفتار و هەڵسوکەوتانەی حکوومەتی بەغدا چۆن بوو بوونە تاوێری ڕێگەی نەشونمای ئاسایی چیرۆکی کوردی و... چەندێ ڕێگەی لە داهێنانی نووسەرانی ئەم بوارە گرتبوو؟

- ناسین و پارە و پەیوەندییە تایبەتی و لارەکان (هەڵمبگرەو هەڵتدەگرم) و شتی دیکەش، تانوپۆی نێوەندەکەی شێواندبوو، بەڵکو دزێواندبووی. سانسۆر و مەقەست بەدەستانی کورد، زۆر لەوانەی بەعسییەکان دڵسۆزتر بوون بۆ ڕژێم و بێ بەزەییانە،

توندو تیژتر بوون. ئەوە بێجگە لەوەی نووسەرانی خاوەن هەڵوێست بەرەنگاری دەکراو ناچار دەکران، پەنا بەرنە بەر هێماکاری و مۆنتاژ و شتی وا، کە بە کونی دەرزیلەکەوە بچێ. بەلای منەوە، ئەو کارەی ئەوان لە بەرژەوەندی هونەری ئەدەبیمان کەوتەوە. خۆ رێگەی شاخیش والا بوو، بەڵام ئێمەمانان سوور بووین لەسەر نووسینی ئەدەبی بەرەنگاری لەو لاپەڕانەدا، چونکە خۆمان بە خاوەندی شەرعی دەزانی و... بەری بڵاوی هەبوو بۆ گەیشتن بە شاران و شاخ و هەندەرانیش. چەندین جار بەرهەمەکانم (رەفز) دەکراو.. ناوم دەگۆڕی، یان بۆ گۆڤارێکی دیکەم دەنارد و خواو راستان، لەوێ پەسند و بڵاو دەکرایەوە. ئەگەرنا، ئەوا پەڕەکانی شاخ، باوەشیان لە بەرهەمە زەق و چاو قایمەکان دەدا. لە (دە) ساڵی دوای (١٩٧٠)دا ئەدەبەکەمان-بەتایبەتی چیرۆك- گەشایەوە، کەچی پاش هەشتاکان، گەرووی چاپخانەی بەغدا تا دەهات دەگوشراو.. بەرهەمی کرچ و کاڵ و لایەنگری رژێمی لە ئامێز گرت، بۆیە بە دەگمەن شتی باش دەخوێندرایەوە.. هەبوون لایەنی بێدەنگییان پەسندکرد. ئەم بۆشایی و کەلێنە، هەلی دایە چنگ قەڵەمە لەرزۆکەکان و دەرفەت قۆزان و.. کردیان بە شاییلۆغانی خۆیان و.. بازاڕی هەرمێنی هەرزەگۆیی و.. وشە خەساندن و.. ملکەچییان، بەڵام بۆ مێژوو دەڵێم: کە زۆربە فریویان نەخواردو نەبەزین و سەربڵند مانەوە، چ بە نووسین و چ بە بێدەنگی. ئەو دەنگە نەشازانەی ئەو کاتە، پڕ لە پەتاو دزێوی و هەرەس هێنانەیان، وەکو گوژاڵك بوون بە نەشازی و نەویستراو و تاڵی، گلۆر بوونەوە بۆ ناو توونی بێ بایەخی و نەفرەتەوە. راستت دەوێ، هەڵناگرێ باسیان لێ بکەم.

- لەپاش وەدەستهێنانی ئەم نیمچە ئازادییە و ئەم بوارە دیموکراسییەی ئێستا لە کوردستاندا هەیە، ئایا رۆڵی ئەدەب بەگشتی و چیرۆك بەتایبەتی چۆن دەبینن؟ ئایا ئومێدی ئەوەتان هەیە، کە ئەم بابەتە (ئەدەب بەگشتی و چیرۆك بەتایبەتی) لەلایەکەوە، داهێنانی شاکارانە بەخۆیەوە بگرێت و لەلایەکی تریشەوە، ببێتە چەکی فیکریی فراوانکردنەوەی ئەم بوارە سەربەستییە دیموکراسی هەڵگرە؟

- ئازدابییەکی تێکەڵ بە ئاژاوەو هەڵەشەیی و ناهۆشیاری و هەست بە نەبوونی لێپرسراوی دەکەم. وابزانم، ئەمیش لە ئاکامی سەرکوتکردنی خەڵك و زەوتکردنی مافە ڕەواکانی کوردەوەیە، لە ئەنجامی ئەو هەموو کپکردن و کەبتەو گوشاری ساڵەهای ساڵی سەر هۆش و هەست و هزر هێناویەتییە کایەوە. ئێستا کورد وەکو پڵنگێك دەبینم، کە زیندانی قەفەز و برسێتیی لەش و گیان لاوازی کردبێ و لەناکاو دەرکەی بۆ خرابێتە سەر پشت. خۆ نە ئەزموونێکی سەربەستی و دیموکراسیی دیوەو نە لە دراوسێکانیدا هەیە. دڵنیام پاش ئەم تاقیکردنەوە تازەیەی، هەست بەوە دەکات، کە پێویستە ژیانی ڕێك بێ و دەسەڵاتی یاسا سەروەربێ و هێزی خۆی لە خۆیەوە بێت. دەنا، کاروبارەکان بە ئیفلیجی دەمێننەوە.

گەلەکەمان هەر هەمان گەلە، کە دێوانە ڕاپەڕی و بەوپەڕی پیرۆزی و مەزنیشەوە کۆڕەوی ملیۆنانەی کرد. لە هەردوو ڕاپەڕین و شۆڕشدا، لە شکستی و هەرەسدا، مەزن و هێژا بووە، بۆیە هەر خۆیشی ڕێگەی ڕاستەقینەی خۆی دەگرێ. ئەدەب، بۆی هەیە ڕۆڵی گرنگ ببینێ لە هۆشیارکردنەوەو هاندان و ڕۆشنبیرکردنی جەماوەر، بەڵگەشم ئەمەیە، سەرەڕای گرانی و خۆڕاگرتنی جەماوەر و گەمارۆی ئابووریی (دووسەری) هۆڵەکان جمەیان دێ و بە ئاسانی جێگە دەست ناکەوێ. ئەمە چی دەگەیەنێ؟ ئەگەر ئەوە نەبێ، کە کوردەکەمان تێنووی هونەرن، تامەزۆری جوانین و خۆراکی گیانیان دەوێ. ئەوە نییە لە هۆڵە ساردەکاندا، دوو سەعات و سێ سەعات گوێ شل دەکەن بۆ دەنگی شیعر و ئەدەب و لێکۆڵینەوەکان، هەروەها بە گەرمی، بەدەیان، بەشداریی گفتوگۆ دەکەن و زیرەکانە کۆڕگێڕان ئەخەنە بەر بارانی پرسیارەوە. هەرچەندە، ئەم ئازادییە لایەنێکی سەلبیشی هەیە لەوەی، کە بڕێ ڕۆژنامە و ناملکەی نەبەکام و بە پەلەی دەراند، ئۆباڵەکەشی لە ئەستۆی سیاسەتمەداری کوردە، کە بەبێ نەخشە و پلانێك، پارەی شۆڕش دەبەشێنن و هەندێك وەکو شاباش پەرتی دەکەن. سەرەڕای ئەوەش، ئومێد دەخوازم، پارتەکان و بەتایبەتی ( بەرەی کوردستانی) خەمی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی چاك بگرێتە ئەستۆی خۆی و چیتر کەمتەرخەمی نەنوێنن

وەکو ئێستا هەیە. هیوابڕنیم لە دوارۆژی ئەدەبیی رەسەنمان، بەتایبەتی کە تازەگەریی دەنگە زولاڵەکان بڵند دەبنەوە. بۆ لاپەڕەی رۆژنامەی نەکەنە پەرستگەی ئالوگۆڕکردنی بیروڕاو دیموکراسی و داهێنان؟ هیچ نەبێ لەم دۆخە ناسکەی شۆڕشە ئابلۆقە دراوەکەمان. هێڵی رەوتی کۆمەڵایەتی و پیشەسازی... دەبێ هاوتەریب بڕۆن لەگەڵ رەوتی ئەدەبی و هونەری، دەنا رێژەکە دەلەنگێ و پارسەنگ دەکەوێتە نێوانەوە. دووپاتی دەکەمەوە، دەسگیرۆیی دەسترەنگینەکان کارێکی نەتەوایەتییە و هیچ کەمتر نییە لە دابینکردنی ئاسایش و نەوت و خۆراك و دیموکراسی بۆ خەڵك.

- دەمانەوێ بەرەو لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی بچین. ئایا بارودۆخی ئازادی و دیموکراسی لە کوردستاندا، کە تێکەڵ بە نامسۆگەریی دوارۆژە، چۆن دەبینن؟

- بارودۆخی ناوخۆ و دەرەکی، ئێجگار شیاو دەبینم. دەرگا وازە هەر وەکو چۆن لە پاش جەنگە جیهانییەکانی یەکەم و دووەم رەخسا بۆ گۆڕانکارییە رامیارییەکان و... بەداخەوە کوردی ئەوددەمە، هەلیان نەقۆزتەوە، یان فریودران! ئێستاش لە هەمان هەڵە دەترسم و لەگەڵ خۆمدا دەڵێم: دیسانەوە نامانکەنە بەردی دامەو گەمەکانیان؟ ئەفسانەی سنووورە پیرۆزەکان پووچ بۆتەوە. دەوڵەتە زلەکان دەتەرەکێن و دەوڵەتۆکەیان لێوە دەبێت. باهۆزی دیموکراتی و جیهانی نوێ (عەولەمە) دەبێ شنەبایەکی نەگاتە ئەم کوردستانەمان؟ ئەم مەسەلەیە زۆر ئاڵۆزەو کاتی زۆری پێدەوێ، بەڵام (ئابووری) دەکەمە تەوەری گۆڕانکارییەکان بە رامیاریشەوە. هەر کاتێ، ئێمە توانیمان دەست بەسەر بەروبووم و کان و بیرە نەوت و گشت ئابووریماندا بگرین و بووینە خاوەندی راستەقینەیان، ئەوسا مەسەلەکە کۆتایی هاتووەو ئاواتە ستراتیژییەکەمان هاتۆتە دی. بەپێچەوانەش، هەر لە بازنەی بێهوودەیی و خۆ جوینەوەو هەڵەدا خۆمان دەبینینەوە. ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە، کە ئەو بازنەیە، لە چوار لاوە بشکێنین؟ ئەڵبەتە لەچاو گرتنی مەوزووعییانەی باری نێو دەوڵەتان و دەرو دراوسێ، خاڵێکی پەسندە، بە مەرجێك، چۆکمان نەشکێنێ و لە هەمان گرێی جارانەوە نەڕوانین. ئەوەی مایەی سەرسووڕمان و ژانە، هەندێ پارتی سیاسی سەقامگیر نەبوونە لەسەر ستراتیژێکی

دیاریکراو و ئاشکراو.. بەگوێرەی بازاڕی دەوڵەتی دروشم هەڵدەبڕن. ئەمڕۆ لە هەر ڕۆژێك زۆرتر پێداویستیمان بە هەڵوێستی یەکگرتووی کوردستانی گەورە هەیە، مسۆگەری و نامسۆگەری، بەندە بە باوەڕ بەخۆبوون و هەڵسەنگاندنی زانستییانەی هەمە لایەنی شۆڕش و پشتبەستن بە کۆمەڵانی خەڵك و سووتەمەنیی ڕاستەقینەی گشت ڕاپەڕین و شۆڕشەکانمان.

ئەز، لەوە سەرم سووڕ دەمێنێ، کە حیزب هەبوو هەتاکو ئەو زووانە کوردی بە نەتەوە نەدەناسی. ئەمڕۆکە دروشمی مافی چارەنووسی بەرز کردۆتەوە. لە کاتێکدا، پارتە نەتەوەیی و نیمچە چەپڕەوەکان هەرگیز داوێنی ئۆتۆنۆمی و فیدراڵی بەرنادەن. ئاشکرایە. سیاسەت بازاڕ و بۆرسەی (بمدەرێ و دەتدەمێ)یە. سەواو مامەڵە لە ئارادایە. گرنگ ئەوەیە هەلی ڕەخساو لەبار نەچوێنین و ببێتە مایەی تەشەر و سەرزەنشت و تونجی بەچەکانی داهتوومان. وەکو چۆن ئەمڕۆ، پەنجە بۆ تەسك بیری و فریوخواردن و ساکاریی ڕابەرانی پێشوومان درێژ دەکەین. خۆ لەنێوان ئەوسا و ئیمڕۆدا دەیان ساڵ هەیە.

-پرسیارێکی کراوە خۆت چیت بەلاوە گرینگە؟

-سەقامگیربوونی ئاسایش و دیموکراسی و بارە ڕامیارییەکە، ڕەنگ لە لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری

دەدەنەوە، پەیوەندییەکی نەپساو و دینامێکی لە نێوانیاندا هەیە. ڕژێمی دیکتاتۆری، لە چەکی کیمیاوی و داپڵۆسین و زیندە بەچاڵکردن و ئەنفال و وێرانکاری بەولاوە، چیمان پێدەکات، کە دروشمی سەرانسەری کوردستانمان بڵند کردەوە؟ وابزانم ڕای جیهانی، بەتایبەتی ڕای خەڵکانی دنیا لەگەڵ ئێمەدایە، ئیتر بۆ چ لە شێرە بەفرینەکان بتۆقین؟ ئەدەبی مولتەزیم هەرچەندە داوی سیاسەتی بەدەستەوە نییە، بەڵام (شایەتی چاوی تیژی سەردەمەکەیەتی) ئەمە قسەی ئەدیبێکی پایە بڵندی جیهانە.

سوپاسگوزاریم دووپات دەکەمەوە بۆ ئەو دەرفەتەی، کە ڕەخساندتان بۆ ئەوەی بە کامی دڵ و ڕاشکاوی لەگەڵ خوێنەراندا بدوێم.

**عەبدوڵڵا سەڕاج:**

# سیمای سەرەکیی ئەم ژانرە کورتی و چڕییەکەیەتی



**دیمانە: سابیر رەشید**

**رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ١٦٧**

چیرۆكنووس (سابیر رەشید) لە رۆژنامەی (كوردستانی نوێ)دا بەرپرسی لاپەڕە ئەدەبییەكەی بوو، چەند تەوەرێكی ورووژاند، لەوانە: چیرۆكی زۆر زۆر كورت، كە ئەز، (چیرۆكۆكە)م بۆ تاشی، هەرچەندەش بە (كورتیلە چیرۆك) و (پۆستەرە چیرۆك) و (سەرنجە چیرۆك) و (رۆژانە چیرۆك) و.....تاد، ئاماژەی بۆ دەكرێت. ناوبراو لە ژمارە (١٦٧) دا، پرسیارێكی ئاڕاستە كردم لەبارەی (بۆچوون و تێڕوانینتان لەمەڕ چیرۆكی زۆر كورت، یان.. چیرۆكۆكە..چییە؟) لە خوارەوە، دیدی خۆم دیاری كردووە.

ئەڵبەتە، دەرفەت و بارودۆخی ئەمڕۆمان، خەستكردنەوەو كورتكردنەوەی گەرەكە. باس لە چیرۆكی زۆر زۆر كورتە Short Short Story بۆیە ئەز، بەشێوەیەكی برووسكەیی، تێڕوانین و بۆچوونی خودی خۆم تۆمار دەكەم. نكوولێشم لەوەدا نییە، تازە بابەتێكی گەرم و ناسكی ئەوتۆیە، كە پتر هەڵدەگرێ و دەشێ كەسانی دیكە، لە گۆشە نیگای جوداوە، توێژینەوەو نووسین بە ئەنجام بگەیەنن. خۆ ئەگەر لە شۆڕشی تەكنۆلۆژیا و گۆڕانكارییە جۆراوجۆرەكانی كۆمەڵایەتی و ئابووری و هونەری و.....تاد، زۆری پێدەوێ و تەنیا بە قەدەر ئەوەندە باس دەكەم، كە پەیوەندیی بە تەوەرەكەوە هەبێ و چ كارانجامێكی هەبووە لەسەر رێبازە هونەری و ئەدەبییەكان بەگشتی و سەرهەڵدانی جۆرە چیرۆكێكی ئێجگار كورت، كە لەژێر ناوی جیاوازدا ناوبانگی هەیە، بارودۆخی گورجی سەردەم ئەو ئاوەی رشت، كە چ هونەرمەند و چ ئەدیب، لایەنی تایبەتمەندی و چڕكردنەوە بگرن، ئەوەتانێ شانۆنامەی درێژی ئاسایی، هەردوو جمكانەی مۆنۆدراما و شانۆی یەك پەردەیی لێ كەوتەوە. چامەی شیعری دێرینە، بێچوویەكی خنجیلانەی لە باوەشی گرتووە، كە بە پۆستەر و هۆنراوەی كۆپلەیی ئاماژەی بۆ دەكرێ. هەرچەندەش بەلامەوە، رەنگدانەوەی شیعری رەسەن و لەمێژینەی ژاپۆنی و چینییەكانە. لە شێوەكاریدا، نموونەی هەرە دیارمان هەیە لە

سکێچی ناو رۆژنامە و گۆڤار و هەم لە پۆستەری پێشانگا و شانۆ و تابلۆی بەرگی کتێب و بڵاوکراوەکاندا. تەنانەت لە مۆسیقاش ئاوازی کورت و رەزمی بەلەز خۆی دەگەڵ گیانی سەدە تیژپەڕەکەماندا دەسازێنێ، بەڵام ئەگەر هاتوو چیرۆکۆکەمان بە کورتکراوەی چیرۆکی ئاساییمان زانی، ئەوە وەك ئەوەیە چیرۆکی ئاسایی بکەینە بێچووی حەقایەت و... رۆمانیش پاڵ بدەینە قەد مێژووەوە. ئەوساش، راست و چەپێك بەسەر تخووبە هونەرییەکانی ژانرەکان دەهێنین. وەکو دەرمبڕی، تەنگوچەڵەمەی کاتی لەلایەك و پێداویستیی رۆژنامەگەری لەلایەکی ترەوە، ئەم چیرۆکۆکانەی خەملاند، کە لە وێستگەی پاس و چاوەڕوانیی ژەمە خۆراکی پەلەو هەر دەرفەتێکی دیدا، خوێنەر مێشکی پێ زاخاو بدا. بێگومان ئەم چیرۆکۆکانە بە هیچ جۆرێك پلەو پایەی کورتە چیرۆك ناگرنەوە. ئێستا بە چاکی دەزانم، کە نەختێك لە خودی زاراوەکە بدوێم. لە ئینگلیزیدا بە (شۆرت شۆرت ستۆری) ناسراوە. عەرەب، هەتاکو ئێستاش وەکو ئێمە، رێك نەکەوتوون لەسەر زاراوەیەکی پوخت و پەسند، بۆیە بە: (القصه القصیره جداً) و (الأُقصوصه) و (قصص بحجم الکف) ناوی دەبەن. لای خۆشمان، هەر یەکەمان، لە عاست خۆیەوە، زاراوەیەکی-لە بێدەنگیی و دەروەس نەهاتنی کۆڕی زانیاریی کورد- بۆ رەخساندووە: (چیرۆکی زۆر کورت) و (رۆژانەی چیرۆك) و (سەرنجەچیرۆك) و (کورتیلە چیرۆك) و (پۆستەرە چیرۆك)مان بەرچاو دەکەوێ. ئەمنیش بە (چیرۆکۆکە) ناوم بردووە، چونکە یەکێ لە مەرجەکانی زاراوە تاشین، ئەوەیە کورت و یەك وشەیی بێت باشترە. بەهەرحاڵ، ئەمێستا لە ئاستەنگی زاراوە تاشین و هەڵبژاردندا نین، وەلێ هەڵسەنگاندنی چیرۆکۆکەو بەراوردکردنی لەگەڵ هاونموونەکانی جیهانی، کارێکی بەجێ و دروست و پێویستە، بۆیە لە چەند خاڵێکی خێرادا، گۆمەکە دەشڵەقێنم بەو ئاواتەی ببێتە هەوێنی توێژینەوەی رەخنەگران و نووسەران.

یەکەم: سیمای سەرەکیی ئەم جۆرە (ژانرە)، کورتی و چڕییەکەیەتی، کە لە ئەورووپا و ئەمەریکادا، پێوەرەکەیان لە نێوان پێنج سەدو هەزار و پێنج سەد وشەدا دیاری کردووە، کەچی ئەم پێوانەیە زۆربەی چیرۆکە کورتەکانی ئێمە دەگرێتەوە، کە دوو سێ

لاپەڕەی گۆڤار دەردەچن. لە کاتێکدا، چیرۆکی لەوەش زۆر زۆر کورتیشمان هەیە. بە نموونە: چیرۆکۆکەی (شەمەندەفەر)ی کاك سابیر رەشید بیست و پێنج وشە تێناپەڕێنێ. چیرۆکۆکەی (ژن)ی من، شەست حەفتا وشەیە. باشە، ئەم چیرۆکۆکە زۆر کورتانە، سەر بە کام زاراوەن؟

دووەم: چەندە پێناسەی چیرۆکێك بکەین، کەچی شەقڵی تایبەتمەندیی نووسەرەکەی تێدا دەردەکەوێ، وەکو: ناواخنی بابەت و هەڵبژاردنی گۆشە نیگاو لەگەڵ نیگارکێشانی کەسایەتی و چلۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی گرێکوێرەکان.....تاد.

سێیەم: نووسینی ئەم چیرۆکانە ئاسان نییە، بەڵکو بەلای منەوە، دژوار و ركە، چونکە خەستکردنەوەو لابردنی وشەی ناپێویست و بژارکردنی وێنە و هەڵوێستەکان بۆ ئەوەی بگەنە کارانجامی دیاریکراو، سەلیقەو هونەری وردەکاریی پێدەوێ.

چوارەم: ئەم شێوە نوێباوە، پەسند و گونجاوە لەگەڵ دۆخی راپەڕین و هەڵوەستە و سروشتی رۆژنامەوانیدا.

پێنجەم: دوارۆژی ئەم چیرۆکۆکانە پرشنگدار دەبێ و رۆژ بەرۆژ چیرۆکنووسان پتر لای لێ دەکەنەوە، لێ هەرگیز بریکاری چیرۆکی کورتی ئاسایی نییە.

شەشەم: تەکنیکی نوێ زۆر شیاو و کاریگەر نییە، مەگەر بە دەگمەن، وەکو: Flash Back فلاش باك و گەڕانەوەی کاتی و جێگەیی و یان تەداعی و.....تاد، چونکە بە ساکاری، مەبەستی سەرەکییی چیرۆکۆکە (ئێستا)یە.

زۆر بە کورتی، هونەری چیرۆکۆکە نووسین لە: (سەرەتای سەرنجکێش+رووداوی بچکۆلانە+کۆتایی رەچاو نەکراو) کۆدەکەمەوە. ئەڵبەتە لەبەر کەم شوێنی نەبوایە، باسم لە بنەماکانی چیرۆکۆکە دەکرد، وەکو سێیەکەی گریکی (الوحدات الاغریقیه): کات+رووداو+شوێن و.. ئەوانەی دیکەی وەکو: ناوەڕۆك-کێشە-کەسایەتی-گوزارشت- دووان-تانۆپۆ (الحبکه)، بەلام با بۆ نووسینی دیکە بمێنێ. لێرەدا، هەروەکو بەرکولێك، چەند (تێبینی)یەك تۆمار دەکەم، کە لە ئەزموونی خۆم و

خوێندنەوەی دەیان چیرۆکۆکەی بیانی و خۆماڵی لەلام گەڵاڵە بوونە و زۆربەی نووسەران پێی قایلن.

ئەلف: چیرۆکۆکە، ئەوە هەڵناگرێ، کە نووسەر بە زەقی لە توێی وشەو دێڕ و هەڵوێستەکاندا دەربکەوێ.

بێ: مەرج نییە نووسەر خۆی بە گشت بنەماکانی دارِژتنی چیرۆکەوە ببەستێتەوە، بەڵام هەرگیز ناشێ بنەما بنەڕەتییەکان پشتگوێ بخات، دەنا سنووری هونەریی جۆرە (ژانرە) ئەدەبییەکان ئاڵۆز و تێکەڵ دەبن.

پێ: کۆتایی رەچاونەکراو رەچەڵەکی چیرۆکۆکەیە.

تێ: ئەگەر مێشکی نووسەر پڕ کێشە و سیخناخ بوو لەمەڕ چارەسەرکردنی دۆزە گشتییەکان ئەوا ناتوانێ چیرۆکۆکەیەکی سەرکەوتوو بنووسێت، هیوادارم بەم وەڵامە کورتە، خشتێکم خستبێتە سەر بناغەی هونەری چیرۆکۆکەی کوردیمان بەو نیازەی لە دەرفەتێکی تردا، لایەك لە بنەماکانی چیرۆکۆکە بکەمەوە.

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# بەکاربردنی تازەترین تەکنیکی گونجاو بۆ قووڵکردنەوەی تێکستەکان



دیمانە: غازی حەسەن

ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ژمارە ٨٦

لە هەفتەنامەی (ئالاَی ئازادی)دا، کە (غازی حەسەن) سەرپەرشتی دەکرد و (سەباح رەنجدەر)ی شاعیر بەرپرسی لاپەڕەی ئەدەب بوو، لە ژمارە (٨٦) ی رۆژی ١٩٩٣/٨/٢٢دا ئەم پرسیار وەك پرسیارێکی کراوە بلاوکرانەوە و هەموو ئەدیبێك بۆی هەیە وەلاَمی بداتەوە.

- ئایا نوێخوازی غەرابەت و نەشازیی شێوازە، یان فانتازیا گێڕانەوە؟

- یاخیبوونە لە دەربڕینە ئاساییەکانی پێشوو بەبێ ئەوەی هۆکاری ئەو یاخیبوونە بزانین، یان چیتر؟

- ئایا نوێخوازی و نوێخوازان لە (ئێستا) و (رابردوو) دابڕاون، چونکە رووگای ئەفراندنیان لە (داهاتوو)یەکی بێ رابردووە؟

- نوێخوازی، بەکاربردنی نوێترین تەکنیکی سەردەمە لەناو تێکستدا بەبێ گوێدانە لایەنی بابەتی و پێداویستییە هونەرەکان؟

- خۆ دوورەپەرێز لە خەم و تەنگوچەڵەمەی ململانێی خەڵك و شەقام و گەڕەك، یان؟

- نوێخوازی، رەتکردنەوەی ئاستەنگە کۆمەلاَیەتی و ئابووری و سیاسی و.....تاد، بۆ ئەوەی لە دوورگەی پیرۆزی داهێنان و ئەفراندنی وشە و زماندا بچینە خەڵوەتگای خود و لەوێ (حاڵ) بمانگرێ، یان؟

- تۆمارکردن و وێنەکێشانی فۆتۆگرافییانەی زاتی هونەرمەندی داهێنەرە، یان هەر لە خۆیەوە بۆ خۆی؟

ئەمە وەلاَمی بەندەیە:

پرسیارەکان زۆر زۆر هەڵدەگرن. بەندە، ئەو مەسەلەیە هەرە گرنگ و هەمیشە گەرم و زیندووەم لە حەوت خاڵدا خەست کردۆتەوەو خاڵی دیکەش، رەنگە هەبن، کە فەرامۆشم کردوون، تەنیا لەبەر ئەوەیە، بگەینە ئەنجام، یان هەر نەبێ، هەنگاو بەرینە رۆخی بڕێ راستی لەبارەی داهێنان و نوێخوازی و زۆرانبازیی رەوای وەچەکان (الاَجیال)

رووەو فەلسەفەی هونەر و گۆڕانکاری و ڕەوڕەوەی مێژوو. بەلامەوە، دەشێ نوێخوازیش لە چەند خالێکدا کۆبکەینەوە؟

١- بەکارهێنانی ئاگایی و ماریفەتی بەرین و هەلگۆزتن لە کانیاوی سازگاری گشت هونەرەکانی گوێ و چاو و.....تاد.

٢- خۆبەستنەوەیەکی زانستییانە بە دیاردەی گۆڕانکارییە ویستراوەکان (ئیجابییەکان).

٣- بەکاربردنی تازەترین تەکنیکی گونجاو بۆ قوولکردنەوەی تێکستەکان، نەك تەنیا ئەو تەکنیکە باوانەی ئەمڕۆکە لە ئارادان، بەلکو گەڕان بەدوای تەکنیکی دیکەش.

٤- هەنگاونانی هاوتەریب لەگەلّ پێشکەوتن و داهێنانی مرۆڤایەتی و قۆزتنەوەیان بەشێوەیەکی هونەری.

٥- ڕەگ داکوتان لە (ئێستا) و (ڕابردوو) بە مەبەستی هەنگاو گواستنەوە بۆ (داهاتوو).

٦- هەلوێستی سۆفیگەرانە و دیالێکتانەمان هەبێ لەگەلّ زماندا، بێجگە لە تێڕوانینی تایبەتی و ڕەنگدانەوەیان لە بەرهەمدا.

٧- خۆ دوورکردنەوە لە ئیدیۆمی سوواوی سەلەفی و ڕستەی لە قودی گیراوی ئاسایی بێگومان ماکی هەموو لە: (سەربەستیی دەربڕین) و (ڕاستگۆیی) و (ئەزموون)ی خاوەند قەلّەمەکانەوە سەر هەلّدەدەن. خۆ ئەگەر بێتو باس لە نووسینێك بکەین، کە لە پشتی ڕژێمەوە، بە نهێنی و لە چیاکاندا لەدایك دەبێ، ئەوا دەشێ ڕێچکەیەکی تر بگرمە بەر و لەلایەکی دیکەوە بۆی بچم، کە نیازی ئەم وتارۆکەیەکم نەبووە.

تێبینی:

زاراوەی (نوێخوازی) هەتاکو هەنووکە لە بری (الحداپە)ی عەرەبی بەکاردێ، هەرچەندەش لەلام زۆر پەسەند نییە، خۆ زاراوەی (تازەگەری) و (نوێکاری)ش هەن، شاعیر (سەباح ڕەنجدەر)یش زاراوەی (نوێبەخشی) بۆ بەکاردەهێنێ.

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# تاڕادەیەك بەهەرمەكانم فەنتازیایان پۆشیوە



دیمانە: ئەنوەر مەسیفی

گۆڤاری تێڕامان، ژمارە ١

- چۆن دەڕانیتە فەنتاز و بە چ بارێك لە بەرهەمانت بەكاریان دەهێنیت؟

- ١-١: لە دانوستانی رۆشنبیری و كۆڕ و دیمانەكاندا، زاراوەی فانتازیا Fantasy بەرگوێ دەكەوێ، تەنانەت هەن دەڵێن: بەرهەمەكانم، تاڕادەیەك فانتازیای پۆشیوە، بۆیە لە جیهانی كافكا و كۆنراد و بۆرخیسەوە نزیكە. لێرەدا، دەمەوێ واتای زاراوەكە لە سنوور بگرم، هەرچەندەش لە ئەدیب و هونەرمەنداێم بیستووە، كە بە هەڵە، یان ناتەواو راڤەیان كردووە، یان هیچی ئەوتۆی لێ نازانن. دەخوازم بەشێوەیەكی فراوان یەكالآی بكەمەوە، بەگوێرەی ئەزموون و خوێندنەوەی خۆم، ئایا:

ئەلیف: خەیاڵبازی و خەون و زیندەخەون و Day Deeaming وڕێنە و هەڵوەسەیە؟

بێ: رووداوی سەیر و سەمەرەو UNCANNY سەربردەو داستانی پاڵەوانی نەبەزی دێرینمانە؟

پێ: جیهانی ناماقووڵ و نادیار و ئەفسانە و تەلیسم و ئەفسوونی جنۆكە و فریشتە و خێو و تارماییيە؟

كەوا، سەرجەمیان واتایەكی هێماسازیمان پێدەبەخشن. لە ئەمانە و پرسیاری دی، ناچارم ببێژم: هیچیان نییە و لە گشتیانیش نزیكە، بەڵام دەشێ پەیوەندییەكی توند لەگەڵ (ترس) و (عاجباتی)دا هەبێ.

١-٢: پێشەكی، چاك وایە ئاماژە بۆ ئەو جیهانە فانتازییانە بكەم، كە نووسەر دەیئافرێنێ و لەسەر كۆڵەكەی ریيالیدا راوەستاوە، هەرچەندەش:

یەكەم: جیهانێكی جوانتر و جودایە لە مەنتقی Logic ئاسایی و یاسای سروشتیمان، هەروەكو چۆن نووسەری ریيالیزمیش، جیهانێك دروست دەكات، كتومت لە میكانیزمی ئەو واقعە ماترياليیە ناچێ، كە هەیە.

دووەم: دەشێ بڕوا بەو جیهانە نابارە، ناماقووڵە، نائاساییە بکەین، چونکە بە شێوەیەك لە شێوەکان، وەك لە ئاوێزە (موشور)ێکی کریستاڵەوە ببیندرێت ئاوها رەنگدانەوەی هزر و مەنتیقەکانمانە، بگرە لە پاڵەپەستۆ و تەنگەتاویی ژیان و ناتەبایی و ترسەوە، رەودیوی ئاگاییمانەوە دێتە کایەو لە عالەمێکی هێمادا Allegory بەرجەستە دەبێ.

١-٣: ئەگەر ئەو بۆچوونەمان پەسند کرد، کە (ئەوەی لە سنووری هەستدا بوو، ئەڵبەتە لە سروشتدا هەیە، ئەگەرچی سەیر و سەمەرەش بوو.) جۆزێف کۆنراد گوتەنی، ئەوا پانتایی Space خولگەکەمان پڕە لە نهێنی و دیاردەی نەپشکنراو، کە خۆشمان نازانین چۆن کارمان تێ دەکەن و بە سانایی ملکەچیانین.

وێڕای ئەوە، کۆی زانستیمان، لە رێگەی پێنج هەستەکەوەیە، بۆیە ئەوەی درکی پێدەکەین، ناتەواوە، چونکە عالەمی دیکە هەیە، کە (بەرچاوی) و (بەرگوێ)یی نییە. بە نموونە: ئەگەر مرۆڤ چاوی هەڵۆ و لووتی سەگ و گوێچکەی شەمشەمەکوێرەو ..... تا، هەبوایە، بێگومان بەو رادەیەش، شانەی مێشکی زۆرتر وزەدارتر بوایە، ئەوسا چ مرۆڤێك دەبوو. خۆ ئەگەر گۆی زەوی، قەبارەی بچووکتر، یان گەورەتر بوایە، گورجتر، یان خاوتر بسووڕابایەوە، رووالەتەکان شێوەی دیکەیان دەبوو. ئەی ئەگەر لە جیاتی پێنج هەستی کورت، دە هەستی بە توانا و پتری رادارانە و پێغەمبەرانەمان هەبوایە، چۆن چۆنی دەکەوتەوە؟

١-٤: نووسەری فانتازیا، بە هیچ کلۆجێك لە راستییە نوێیەکان ناترسێ، بەقەد ئەوەی گومانی لە جێبەجێکردنیان هەیە. لەم بوارەدا، فانتازیا رۆڵێکی ئیجابی و گەشبین و بنیاتنەر دەبینێ لە رەوتی نوێخوازیدا. هەروەها بۆ دۆزینەوەی ئەو درز و کەلێنانەی، کە کەوتوونەتە بنیادی مەعریفیمانەوە.

١-٥: ئەوانەی وادەزانن گوایا فانتازیا، خۆ لادان و گۆشەگیرییە لە واقیعە تاڵەکەمان، بە چاکی لە کرۆك و مەبەستی فانتازیا شارەزا نین. ئەز، ئەوە بەڕاست نازانم، بەڵکو فانتازیا کنەکردن و قووڵکردنەوەی ئەو واقیعەیە، بەڵگەشم هەیە، لە سەردەمی خەساندنی بیروهۆش و وشەدا، کاتی (المقص+الرقیب) لە کاردابوو، هەم لە قۆناغی سەربەستیدا، فانتازیا رۆڵێکی کاریگەر و چاونەترسی هەبوو و هەم دەبێ و شاکارەکانی خۆی پێشکێش دەکات و هەمیشە پەرێز لە واقیع و کۆسپ و کێشە کەونییەکان دەگرێ.

٢-١: دەلوێ، بۆ سەرچاوە هەڵگرتن لە فانتازیا، ئەفسانە و داستان و حەقایەتی شەوانەی بەرگوێی ئاگردان و لاوکی دیوەخانان بەو سەرچاوەیە بزانین، لەبەر ئەوەی لە چەند روویەکەوە، چوون یەکن. هەروەها (یوتۆپیا)ی کۆن و نوێش جۆرێکن لە فانتازیا بە نموونە: لە میتالۆژیای گریکدا، خوداکان ئاواتی شایەك بەدی دێنن، دەست بۆ چی ببات ببێتە زێڕ. لە ئەنجامدا گشت ئەندامانی خێزانەکەی دەبنە پەیکەری زێڕین. ئەمە فانتازیایە، هەرچەندە نیازم لە توێژینەوەی چەمکەکەی نییە. حەقایەتی (کلاو سەخری جنی) کوردەواری فانتازیایە، هەروەها حەقایەتی (کالاّ بە بالاّی شا)، کە لە ئەدەبی بەراوردکاریدا، لای کوردو گەلانی تریش چەند نموونەیەکی جودای هەیە، دیسان فانتازیایە، کە جۆلاّیەکی فێڵباز، شای شارێك فریو دەدا، گوایا پۆشاکێکی دانسقە و کەس نەدیتەی بۆ دەکات. لە ئاکامدا، شای گەلحۆ، بەڕووتی دەڕوات و کەس ناوێرێ لەل بکات. منداڵێك نەبێ، هاوار دەکات: دایە، خۆ ناوگەڵ و هەرامەی شا بە دەرەوەیە. وەکو گوتم، ئەوانە جۆرێکن لە فانتازیای ساکاری گەلان.

٢-٢: جیهانی میتافیزیك بەشێکە لە فانتازیای دێرینی گەلان. کوردیش لەو بارەوە، گەنجینەی خۆی هەیە و تێکەڵ بە کەلەپووری دراوسێکانی بووەو بۆم هەیە بڵێم: (دزراوە). ئەمڕۆ، فانتازیای کەون و نوێ، لە پاڵ شیکردنەوەی دەروونزانیدا، لە

واقیعی مرۆڤایەتیمان دەکۆڵێتەوە بۆ دۆزینەوەی ئەو تەڵە داوانەی کە ترس بە ئارەزووەوە دەبەستێ، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی گرفتە ئاڵۆزەکان، هەرچەندەش بە ئامرازی ناباو و نائاسایی بێت، وەکو: خەون و هەڵوەسەو خۆ شێتکردن و دیاردەکانی پاراسایکۆلۆژی و شتی دیکە. ئەگەر بەرهەمی ئەدەبی و هونەری ئارەزووە پەرستراوەکانی ئاگایی و هۆشمەندیمان تێر بکات، ئەوا فانتازیا چەشی رۆحمان تێرو تەسەل و پاراو دەکات.

**٣-١:** کۆڵەکەی فانتازیا، دابڕانی وێنەیە Image لە شێوە ئاساییەکەی، وشە و واژەکان، ئەودیوی خۆیان دەدوێنن و وا لە خوێنەر دەکەن، کە بەشێوەیەکی خوازەیی Metaphor بڕوانێتە ئەو بەرهەمە. دەسازێ بڵێم: خودی وێنەکە، لەلای فانتازیانووس مەبەستە و هەم هۆیە. خوێنەریش، هەرچەندە دیمەنێك دەبینێ، کەچی وشە و رستەکان ئاوسن و مەبەستێکی پیرۆزی دی دەبەخشن. لەم لایەنەوە، نووسەر.. خوێنەرەکەی:

١- هاوبەش دەکات لە گۆڕانکاریی واتاکان.
٢- فێری روانینی نوێی دەکات.
٣- رایدەهێنێ بۆ ئەوەی ئاشنا بێ لەگەڵ ورشەداری نوێدا.
٤- ژیانی لەلا خۆشەویست دەکات بەوەی ماچ و سێکس و بەختەوەری لە سەرووی هەموو شتێکەوە بێت.

**٣-٢:** جاری ئەوتۆ هەیە، فانتازیا لەگەڵ خەیاڵ (Imagination) و وڕێنە و وەهم Fancyدا یەك بگرن، لە راستیشدا ئامۆزاو خاڵۆزان، کەوا رێگە بۆ (نەسەق) Aymmetric خۆش دەکەن، لەکاتێکدا وەهم و وڕێنە، دەرفەت لە بێ ئاگایی هۆش وەردەگرێ، ئەندێشە و خەیاڵ دەبێتە هەڵفڕین و دەربازبوونی هۆش بەرەو نادیار. هەرچی فانتازیایە، ئەوا بەهۆش و عەقڵانییەتەوە جیهانێکی سەیر و سەمەرە

دادەمەزرێنێ. بەجۆرێکی تر دەرەخسێ بڵێم: فانتازیا (تەداعی)ی هۆشمەندانەی نووسەرەکەیە، جا لە رێگەی:

ئەلیف: دۆنای دۆنەوە (التناسخ Transmigrate) بێ، وەکو کەسی یەکەمی رۆمانی (سۆناتای رۆح)م، کە خۆی بە (کیاکسار)ی میدی دەزانێ، کەوا گشت ستراب و هۆزەکانی مادی یەك خست و بەرەو (نەینەوا) چوو......تا.

بێ: لێکترازانی کەسایەتی وەك: دکتۆر (جیکل و میستەر هاید)ی ستیڤنسن.

پێ: گۆڕانی فیسیۆلۆژی (Metamorphosis) وەکو: (گریگۆر ساسا)ی (کافکا) بەیانییەك لە خەو رادەپەڕێ و دەبینێ بۆتە (دەعبا)یەکی زل و ناقۆڵا. یان وەکو کەسی چیرۆکەکەی (گۆگۆڵ) کە دەبێتە (لووت).

تێ: تێکەڵبوونی کاتی، وەکو: چیرۆکی (لاکێشە ڕووناکەکان)ی بەندە کە ئاخێوەر شۆڕ دەبێتە ناخی پاسەوانێکی (حەسحەس) شەو، کە هێمای دەسەڵات و دەوڵەتە.

جێم: هاودەمێتی، بە واتای یەکگرتنی دوو کەس لە هەندێ کات و دۆخدا، کەوا جووتە هێمای چاکە و خراپەن، وەك: شاکارەکەی (گۆتە)، کە دکتۆر فاوست Faust لەگەڵ شەیتاندا پەیمان دەبەستێ و دەبنە هاودەمی یەکدی.

٤-١: زانستی دەروون زۆر بایەخی بە فانتازیا داوە هەروەکو چۆن لە فۆلکلۆر و کەلەپووری میللەتان و چیرۆکی منداڵان و چیرۆکی ئەندێشەی زانستی داوە، کە کانگای خاو و رەسەنن بۆ توێژینەوەی رەفتار و هەڵسوکەوتی مرۆڤایەتی، ئەویش نەك تەنیا بۆ: ئارەزووی گێڕانەوەو چێژ وەرگرتن و فێنك کردنەوەی ناخ، بەڵکو بۆ خۆناسین و ئەنگوست خستنە سەر زام و بینینی راستییەکان و تاراندنی ئەو مەترسییانەی، کە هەڕەشە لە شادی و بوونمان دەکەن.

٤-٢: به دیتنی من، فانتازیا دەبێتە جیهانی تێڕامان (التأمل Meditation) پەیامبەری و پەرچوو (المعجزه Miracle)، کەوا کەم کەس هەستی پێدەکات، خۆ ئەگەر تێیدا قاڵ بوو، ئەوسا وەکو شیکردنەوەی دەروونزانی چۆن واقیع دەپشکنێ و بە دوای هۆکارەکاندا دەگەڕێ، فانتازیاش، ئاوها هەمان واقیع شیتەڵ دەکاتەوەو لە بێخەوە، پاڵپێوەرەکان Motives دیاری دەکات، بەمەیش هاوسەنگایەتیی نێوان ئاگایی و نائاگایی رادەگرێ.

٤-٣: کێشەی نووسەری فانتازیا ئەوە نییە، کە ئاگاداری راستییەکان (الحقائق) نییە، بگرە لەبەر ئەوەی لە رێڕەوی شێوازەکانی پێشووتر بە گومانە. تێدەکۆشێ بۆ دۆزینەوەی نوێیە رێیەك بۆ ئەوەی هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ ئەو راستییانەدا، چونکە لای ئەو، نەگۆڕەکان لە گۆڕاندان و هەمیشە سەرسووڕمانی نوێ رایدەکێشێتە لای خۆی. ئا لەم گۆڕانە دیالێکتیکەدا، راستیی دیکە لە دایك دەبن، بۆیە پێویستە دوو بارەو سێ بارە چاو بە هەڵوێست و کەسایەتی و پاڵپێوەرەکاندا بگێڕێتەوە. ئەمەیە مەنتقی خۆ تێپەڕکردن و داهاتوو.

٤-٤: (فرۆید) لەمەڕ رواڵەتی سەیرەوە دەڵێ: (پاڵپێوەنەر، دووپاتبوونەوەیە لەودیوی ئاگاییدا.)، بەڵام لەوێ بە پێش چاومانەوەیە. ئایا لەم گەردوونەدا هیچی تر نییە؟ وای بۆ دەچم، کە شتەکان، ئەگەرچی لە سنووری سەرووی هەستەکانمانەوە بن و درکیان پێ ناکەین، ئەوا بە گوێرەی زۆربوون و بەربڵاویی ئەو هەستانەمان، زانیاریمان پەرە دەستێنێ. مەودای روانینمان بەو رێژەیە، چەکەرە دەکا و فراوانتر دەبێ، هەروەها بەو ئەندازەیەش بۆمان هەیە گۆڕان لە دانەدانەی هزر و گۆشەنیگامان بکەین، ئەوسا دەبینە پێشەنگ و جێکات بەجێ دەهێڵین.

٤-٥: کاری ئەدەبی، تەنیا خوڵقاندنی کەسایەتی نییە لە پاڵ تۆمارکردن و کەڵەکەکردنی رووداو و دەربڕینی ئاکامی ساکاری کردارەکان، لە کات و شوێنی دیاریکراودا و بەس، بەڵکو دۆزینەوەی ئەو کون و کەلەبەرانەیە، کە لە توییانەوە،

تیشك دەخەینە سەر کەسایەتی بۆ درکاندنی ناخە ئالۆزەکانیان، لەگەڵ روونکردنەوەی پاڵپێوەنەرە بنەڕەتییەکانی ئەو هەڵوێستانە و گەشەسەندنی رووداوی جێکاتی.

**٤-٦:** پەنابردنە بەر فانتازیا: رێگەیەکی کاریگەرە بۆ پێکانی ئەو نیازە، کە دەشێ لە بارودۆخێکی ئاسایی و لە ناو سیمبەندی کۆمەڵایەتیدا، بەو شێوە راستەقینەیە دەرنەبڕدرێ. کەواتە، فانتازیا، هەم تەکنیکە و هەم تانوپۆی بەرهەمەکە دەچنێ، بۆ ئەوەش، پشت بە تێکەڵکردنی سەیرو چاوەڕوان نەکراو دەبەستێ لە نێوان واقیعی دەرەوەو ژوورەوەدا.

**٥-١:** ئاماژە بۆ سێ نووسەری هەرە بەناوبانگی وەك: فرانزکافکا، جۆزێڤ کۆنرادو، ئیدگار ئالان پۆ دەکەم. ئەوەش فەرامۆش ناکەم، کە رۆمانی نوێی ئەمەریکای لاتین، کە بە ریالیزمی ئەفسوونامێز (الواقیعە السحریە) ناودەبرێ، تەرزێکی دیکەی فانتازیایە و (مارکیز) گوتەنی: (دابڕانە لە دەستووری رۆمان نووسینی شێوەی ئەوروپایی.)

**٥-٢:** لە جیهانی (کافکا)دا، کەسایەتی بەهۆی گرێی خۆ بە کەمزانینەوە، تووشی دڵەڕاوکە دەبێ و هەست بە سزای تاوانێك دەکات، کە نەیکردووە. بۆیە دادگایەکی دەروونی دەیتارێنێ رووەو کۆلانی داخراو و بۆسەو چارەنووسی مەرگچێن، کە پڕە لە سووکایەتی، وەك: لە (دادگایی) و (قەڵات)دا، دەسەڵاتی یاسایی بە بۆگەنی دەرخستووە، هەروەکو شمشێرێك بەسەر (جۆزێڤ) و (ك)وە بێت، چونکە خێزانەکانیان و ئەوانەی لەلایان ئیش دەکەن، لەجیاتی ئەوەی تووشی خەم و ئێش و مەترسی بن، لەو تراژیدیایەدا، کەسوکار و کۆمپانیاکان دەیانچەوسێننەوەو لە پاشان هەست بە شەرمەزاریی کۆمەڵایەتی دەکەن.

٥-٣: چیرۆکەکانی (ئیدگار ئالان پۆ) ئەگەر شیاوی ئەوە بن بە فانتازیا ناویان بەرین، لەبەر ئەوەیە، کە پێ لەسەر دیمەنی ناشیرین و دزێو و ناویست دادەگرێ و بەجۆرە سادیزمێکەوە، دەیەوێ هۆشمان بهەژێنێ، بەبێ ئەوەی هیچ لەو کردارە لابەرێت، یان بە واژەی جوان و شیرین دایانپۆشێ. سەرەڕای ئەوەش، بە شێوەیەکی راستەوخۆ (شێتایەتی)ی کەسەکانمان بۆ تۆمار دەکەن.

٥-٤: هەرچی (جۆزێڤ کۆنراد)ە، لە رۆمانی (لەناو جەرگەی تاریکی)دا، فانتازیاکەی لە دوو تەوەردا کۆکردۆتەوە، یەکەمیان: بە گێڕانەوەی (سرد) سەیر، خۆی گوتەنی: (وەسف ناکرێ). دووەمیان: نواندنی هەڵوێست و تێڕوانینی رەوشتانەو ریسواکردنی شەڕەنگێزی و ناهەمواری و کۆڵۆنیالییانەی (کورتز) کەوا لە ریشەوە، بە شەو سزای تاوانەکانی دەیبرژێنێ، بۆیە رۆحێکی شێتانەی سەرکێش بەرەو پێدەشت و دەرەوەی جەنگەڵ پاڵی پێوە دەنێ. کە سەردەمێك رایاندەکێشا.

**عەبدوڵڵا سەڕاج:**

# کێبڕکێ لەنێوان ژیار و رۆشنبیرییەکانی جیهاندا هەیە



**دیمانە: بەهمەن تاهیر نەریمان**

**رۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە ١٤٦**

چیرۆکی هونەریی کوردی، ژانری نوێی نێو ئەدەبی کوردی و دروستبوونی دوای شەڕی یەکەمی جیهانییە. ئاشکرایە گفتوگۆ و کێبڕکێ لە نێوان ژیار و رۆشنبیرییەکانی جیهاندا هەیە و بەردەوام کاریگەرییان بەسەر یەکترەوە رەنگ ئەداتەوە، بوونی هەقایەت لەنێو کوردو رۆژهەڵاتدا، مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە و لە دێر زەمانەوە بەکار دەبرێت، نکوولی لەوە ناکرێ، کە چیرۆکی هونەری، سەرەتاکەی بۆ ژیاریی ئیتالیا دەگەڕێتەوە، لە (دیکامیرۆن)ی (بۆکاشیۆ)وە دەست پێدەکات. سەرهەڵدانی چیرۆك لەوێ و لە ئەنجامی گفتوگۆی ژیارەکانیشدا، بە جیهاندا بڵاو بۆتەوەو لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا گەیشتە کوردستان (T.V)ی (یەکگرتوو) مێزگردێکی بۆ چەند کەسایەتییەکی پسپۆڕ لە بواری چیرۆکی کوردیدا سازدا، کە تێیدا چارەسەری گەلێ کێشەی بەرچڤەبوونی چیرۆکی کوردی دەکات لە قۆناغی پێش راپەڕیندا.. بە باشمان زانی کورتەیەکی ئەو مێزگردە بخەینە بەر دیدی ئەدەب دۆستان.

- بۆ چوونە نێو باسەکەمان و سەرەتاگیری پرسیاری یەکەمان لە یەکەم تێکستی چیرۆکی هونەری دەکەین:

یەکەم چیرۆکی هونەری کوردی لە کەیەوە سەری هەڵداوە؟

- راستە ئێمە لە رۆژئاواوە تەکنیکی هونەری چیرۆکمان وەرگرتووە، بەڵام دەبێ تێکەڵاوی بکەین بە رەسەنایەتیی خۆمانەوە، چونکە ئەمڕۆ خۆماڵییەتی لەگەڵ نوێخوازیدا بوونەتە هاوکێشەیەك لە جیهاندا. هەروەکو مامۆستا (ئیبراهیم قادر محەمەد) ئاماژەی بەوە دا، کە (عەلائەدین سەجادی و عەبدوڵڵا سەڕاج) لە گۆڤاری (بەیان)دا دەیبەنەوە سەر فۆلکلۆری کوردی، ئەڵبەتە لەوێدا گوتوومە، کە (گەرا)ی چیرۆك سەرچاوەی لە هەقایەتی کوردەواری وەرگرتووە لە تەك ئەو هونەرەی لە ئەوروپاوە گەیشتە کوردستان.

- كە باسی فۆلكلۆر هاتە ناوەوە، حەز دەكەین مامۆستا (عەبدوڵڵا سەڕاج) وەكو چیرۆكنووسێ -سوودوەرگرتن لە كولتوور و فۆلكلۆری كوردی لە چیرۆكەكانی خۆیدا روون بكاتەوە؟

- وەكو گوتم، ئەمڕۆ چیرۆكی هونەریی كوردیمان لەسەر شتێ دامەزراوە، كە شانازیی نەتەوەییمانە. من، لە ناوەندی هەفتاكانەوە هەستم بەوە كردووەو فۆلكلۆرەكەمانم دامەزراندووە (توڤیف) لە شێوەی تەكنیكی تازەدا، بۆ نموونە لە چیرۆكەكانی: (هەبوو نەبوو-ئەو پیاوەی زوو سەری سپی بوو- كیاكسار -حاجی قادریی كۆیی- زارا -لەشكری- مەنارەی چۆلی) و زۆر چیرۆكی تریش. ئەمانە، هەموو لەسەر كولتووری گەشی نەتەوەییمان دامەزراون، بەڵام بە بۆچوونە ساكارەكەی نا، بەڵكو دید و بۆچوونی نوێیان پێ دەسپێرم.

- تا چەند چیرۆكی كوردی لە حەفتاكاندا هەنگاوی بەرەو پێشەوە نا ئەگەر بە شەستەكان و پێشتر بەراوردی بكەین، كاریگەریی (روانگە) لەسەر نوێخوازی چی بوو؟

- هەرچەندە بەیانی (١١)ی ئازار رۆڵێكی گرنگی هەبوو لە دەرچوونی روانگەدا، هەروەها (بەیانی شیعری)ی چوار شاعیرە عەرەبەكان، كە گۆڤارێكیان هەبوو بەناوی — شیعر٦٩- بوو. ئەمانە كاریگەریی بوون بۆ روانگە، بەڵام ئێمە: (لەتیف حامید، عەبدوڵڵا سەڕاج، سەلام محەمەد، لەتیف هەڵمەت، ئەحمەد شاكەلی، سەدرەدین عارف) لە دەرەوەی روانگە كارمان دەكرد. (لەتیف هەڵمەت) دەیوت: (روانگە، هێلكەیەكی پیس بوو. هیچی هەڵنەهێنا.) ئێمەی هاوتەریبی روانگە مشووری تازەكردنەوەمان دەخوارد، بەڵام نەچووینە ژێر دروشمی روانگەوە، كە لە پراكتیكدا بەرانبەر بە وتە نوێیەكانیان نەبوون.

- ئایا بەگشتی، تەوژمی هۆشی-تیار الوعی- لە حەفتاكاندا سەری هەڵداوەو بەرەو دواوە هاتووە، یان كاتێكی دیكە؟

- لە ئەدەبدا تخووب هەیە، دەكرێ گۆڤاری (گەلاوێژ) بە تخووبێك دابنێین و بە چەند نووسەرێكی دیارەوە دەركەوتووە. تخووبی دووەم: شۆڕشی چواردەی تەمووزە،

لەوێشدا: ئیحسان مستەفا، مارف بەرزنجی، محەمەد مەولوود مەم، محەرەم محەمەد ئەمین، مارف خەزنەدار، کاووس قەفتان، مستەفا ساڵح کەریم و چەند کەسێك دەرکەوتن. تخووبی سێیەم: لە حەفتاکانەوە دەست پێدەکات، وەکو روانگە و ئەدەبی نوێتر. لە تخووبی چوارەمدا: بیست ساڵێك باز دەدەم، کە راپەڕینە، بەڵام بەداخەوە، نەوەی ئێمە -هەرچەندە ئەفراندن بە تەمەنەوە نابەستمەوە- لە دوای ساڵانی نەوەدەکاندا چیرۆکنووسی دیارییان تێدا نییە، کە حەفتاکانیان-بەگشتی- تێپەڕاندبێ. مەگەر بە دەگمەن، ئەویش لە بەرهەمێکدا نەك وەکو کەس. چیرۆکنووسی باش شك نابەم، کە زۆر تامەزرۆی دەنگی لاوانم و پاڵپشتیانم. ئامۆژگارییان دەکەم، کە چیرۆکنووسی بێ مامۆستا بن، چونکە ئەگەر مامۆستایان هەبوو دەبنە سێبەر و لاساییکەرەوەیان.

تێبینی:

(١) ئەم مێزگردە، راستەوخۆ لە T.Vی (یەکگرتوو)وە پەخش کرایەوە، لەگەڵ هەردوو مامۆستا (هیمداد حوسێن) و (ئیبراهیم قادر محەمەد)دا، کە پاشان پلەی دوکتۆرایان بەدەست هێنا. لێرەدا، تەنیا وەڵامەکانی خۆم تۆمارکردووە.

(٢) ئەم مێزگردە لە تەلەفزیۆندا کاك (بەهمەن تاهیر نەریمان) ئەنجامی دا و کاك (ئەکرەم عەنەبی) ئامادەی کرد بۆ هەفتەنامەی (یەکگرتوو)ی ئیسلامی.

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# کورد هەمیشە لە بارودۆخی چەوسانەوەدا بەرهـەمی بـاش دەنووسێ.




**دیمانە: ئازاد عەبدولواحد**

**گۆڤاری رامان، ژمارە**

عەبدوڵڵا سەڕاج ناوێکی درەوشاوەیە لەناو جیهانی چیرۆك و رۆمانی کوردی. نووسەرێکی ئەزموونگەرو بەردەوام لەگەڵ نووسین و داهێنان لە ژواندایە. وەك چیرۆکنووسێکی خاوەن ئەزموونی خۆی، (ڕامان) بە پێویستی زانی دیمانەیەکی لەگەڵ سازبدا، تا لە کێشەی داهێنان و ئەزموونی خۆی و چیرۆکی کوری بدوێ.

- هەندێ بواری نووسین لەناو پانتایی رۆشنبیریی کوردی بە نوێ دەژمێردرێن، لەوانە رۆمان و کورتە چیرۆك و هونەری سینەماو شێوەکاری، چۆن بڕیارتان دا لەناو بواری نووسینی کورتە چیرۆك و پاشان رۆمان خۆتان بدۆزنەوە؟

- یەکەم چیرۆکم لە ساڵی **١٩٧٣** لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٩) بڵاوکردەوە، کە چیرۆکی (راوە گورگ) بوو، بناغەی دانانی چیرۆکی هونەری کوردیی ئەمڕۆمان، هەرچەندە بیروڕا وایە و رەخنەگرانیش هەر وا دەڵێن، کە چیرۆك هونەرێکی ئەوروپییە و گەیشتۆتە ئێمە بە سێ کوچکەیی (ئیدگار ئالان پۆ) و (مۆپاسان) و (چیخۆف)، ئێستە هەموو گەلان بەدوای رەگ و ریشەی چیرۆکی خۆیان دەگەڕێن. من، لە حەفتاکانەوە خەریکم و دەگەڕێم تا رەگ و ریشاڵێك بۆ چیرۆکی کوردی بدۆزمەوەو لەو دیمانەیەی، کە (عەبدولڕەحمان پاشا) بە عەرەبی لەگەڵمدا سازی دا لەبارەی رۆمانی کوردی، لە یەکێك لەو تەوەرانەدا، کە شەش تەوەرە بوو، بەشداریم کرد، وابزانم لە ساڵی **١٩٨٩**دا بوو، لەوێ سەرەتایەکم پێ ناساند و گەڕام بەدوای رەگ و ریشەی چیرۆکی کوردی، با حیکایەتخوانانەش بێ، بەڵام رەسەنایەتی تێدابێ و بیکەینە خۆماڵی، بەڵام تەکنیکەکانی رۆژئاوا وەردەگرین. (عەبدوڵڵای کوڕی موقەفەع)م دۆزیوەتەوە، کە دیارە نووسەرێکی کوردەو لە هۆزی رۆژبەیانییە. ئەو، هەموو شارستانییەتی ساسانی لە زمانی پەهلەوییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و ژیاریی عەرەبی پێ دەوڵەمەند کردووە. لە پاداشتی ئەوەدا، بە دەسیسەی ئەبو

جەعفەری مەنسوور کوژراوە. لە شاکارەکانی (کلیلە و دمنە)یە، کە لە زمانی عەرەبییەوە بە هەموو دنیادا گەڕاوە، هەروەها: الأدب الصغیر، الأدب الکبیر، الأدب الوزیر، الأدب البسیگ.....تاد، ئەمانە گشتیان باسی ئەدەب دەکەن، بە شێوەیەك، لەو سەردەمەی (کوڕی موقەفەع)دا هیچ کەسێك بەو شێوەیە باسی نەکردووە. هەڵبەتە (کلیلە و دمنە) هەندێك دەڵێن هیندییە و دوایی کراوەتە فارسی، وەلێ دکتۆرێك، کە ناوەکەیم لەبیر نییە ئیسپاتی کردووە، کە خودی خۆی نووسەرەکەیەتی و بەڵگەی مێژوویی هێناوەتەوە، کە ئەو نووسیویەتی. ئەو، زاتە ئەوەندە عارەبی زان بووە، لە هەموو دانیشتنەکانی (مەربەد)ی بەسرەدا کورسیی تایبەتی هەبووەو هەموو شاعیر و ئەدیبەکان چاوەڕێی رەخنە و بڕیاڕی ئەم بوون. تەنانەت بڕیار و قسەی نەدەگێڕدرایەوە، ئینجا کەڵکم لەمە وەرگرتووە وەك بابەت نەك وەك تەکنیکی چیرۆکی کوردی.

– ئەو چیرۆکانەی ئەو وەکو رەگ و ریشەیەك بۆ چیرۆکی کوردی دەشێ ئێمە ناوی لێ بنێین رەگ و رشە، لەکاتێکدا ناوەڕۆکەکەی لەبارەی کوردەوە نەبێ و بە زمانی کوردی نەنووسرابێ؟

– بەڵێ، ئەز، وەك لایەنێکی نەتەوایەتی شانازی بەوە دەکەم، کە نووسەرێکمان هەبێ لە سەدەی چوارەمی هیجریدا، هەموو مێژوونووسان دانیان پێداناوە، تەنانەت (وەجد روشدی)ش دەڵێ کورد بووە. ئەمە وەك شتێکی (بەڵگەیەکی) نەتەوایەتی، چیرۆکەکانی وەك (کلیلە و دمنە) بکەمە نموونە، هەرچەندەش بە زمانی عەرەبی نووسراون، بەڵام مۆرکی نەتەوەیی پێوە نییە، گشتییە، جیهانییە، بە زمانی ئاژەڵە، ئاژەڵەکانیش، ئامۆژگاریی دەسەڵاتدار و خەلیفەکان دەکەن. دەتوانم بڵێم: ئەمەی کردۆتە دەمامك بۆ گوتنی زۆر شت. ئەگەر بێتو ئێمەی نووسەران و رەخنەگرانی کورد دووبارە بەم (کلیلە و دمنە)یەدا بچینەوەو دووبارە بیخوێنینەوە، وابزانم شتی جوانی لێ هەڵدەهێنجێنین.

- وادیاره لەو گەڕانەتدا بۆ دۆزینەوەی رەگ و ریشەیەك بۆ چیرۆكی كوردی، خۆت دۆزییەوە، كە چیرۆك بنووسیت، یان چۆن بڕیارت دا چیرۆك بنووسی؟

- ئەمە، لێرە وام لێ دەكات، باس لە ئەدەب، بەتایبەتی لە چیرۆك و رۆمانی ئەمەریكای لاتینی بكەم، كەوا ئێمە بەو ئەدەبەیان سەرسام دەبین كاتێ گەڕاونەتەوە بۆ رەگ و ریشەی كولتوور و داب و نەریت و فۆلكلۆریان. ئێمەش، داب و فۆلكلۆری خۆمانمان هەیە، كە دەتوانین شانازیی پێوە بكەین. ئەمە زیاتر هانی دام. من، پێشتر وەكو هەموو ئەدیبێكی كورد چەند شیعرێكم بلاّوكردەوە، تەنانەت كۆشیعرێكیشم لە سالّی ١٩٧٢دا بەناوی (سێ هەنگاو بەرەو خۆر) لە رەقابە دەرچوو، ئێستاش لەلام ماوە، بەلاّم چاپم نەكرد، چونكە نەمویست لە كۆت و بەندی شیعردا بمێنمەوە. هەستم كرد، زمانێكی پاراوم هەیە، كە دەتوانم چیرۆكی پێ دابڕێژم. هونەر و تەكنیكەكانی چیرۆك شارەزا بووم، ئەو تەكنیكانەش، دوایی دەتوانین بەدرێژی باسی لێوە بكەین.

- لەم حالّەتەدا، كە تۆ وەك شاعیر دەستت پێ كرد دوایی خۆت لە جیهانی چیرۆكدا بینییەوە، چەند سوودت لە زمانی شیعر وەرگرت؟

- چیرۆك و رۆمان شیعراندنی گوتنە، یان داڕشتنە. شیعراندن زۆر پێویستە لە رۆماندا، یان لە چیرۆكدا، تەنانەت لە شانۆنامەدا. هەرچەندە میتۆدی ژانرەكانی ئەدەبی تێكشكاوەو ئێستا شێوەكاری و شانۆش شیعراندنیان تێ كەوتووەو سوودیان لەو زمانە چڕ و خەستە شیعرییە وەرگرتووەو تێكەڵ بوون و تەنانەت لە دوایین رۆمانمدا (كاولاش ١٩٩٧) سوودم لە لۆژیكی ماتماتیك وەرگرتووە، كە لە هەندێ شوێن دەبێتە هاوكێشەیەكی ماتماتیكی.

- لەناو چیرۆكنووسانی كورد تۆ یەكێكی لەوانەی، كە بەرهەمت لە بواری چیرۆك و رۆماندا زۆرە، ئەم بەرهەم زۆرییەی خۆت بەرانبەر ئەوانەی بەرهەمی كەم و پوخت دەنووسن، چۆن لێكدەدەیتەوە؟ ئایا ئەو زۆر بەرهەمییە بەرانبەر بە چیرۆك وای بەسەر نەهێناوی، كە زۆرجار بەرهەمی لاوازی تێ بكەوێ وەك بەدیمان كردووە؟

- یەکەم: ئاستی بەرهەمی هونەری بە خەڵکەوە نابەستمەوە. من، پەیوەندیم بە ئەم و ئەوەوە نییە. دووەم: بەزۆری و کەمی نییە. سێیەم: زۆرم بڵاو نەکردۆتەوە. بۆ نموونە: لە بیست و پێنج ساڵی تەمەنی ئەدەبیمدا ئەگەر چیرۆکەکانم (١٢٠-١٣٠) چیرۆك بن و دابەشیان بکەی بەسەر ساڵەکاندا، ساڵی (٤) چیرۆکی بەرکەوتووە. لە راپەرینەوە تا ئێستا (١٦) چیرۆکم نووسیوە، لە (٧) ساڵدا من ئەوە بە زۆر نازانم، بەڵام چالاکترم لەوانی دی، چونکە ئەگەر رۆژی (٤) سەعات بخوێنمەوە، مانگی جارێك چیرۆکێ دەنووسم، ئەویش ئەگەر چیرۆکم بۆ بێ، وەختێ ژان و کەڵکەڵەی ئەشکەنجە لە دایك دەبێ، لێ هەمیشە لە مێشکمدا دایدەرێژم و قسە لەگەڵ کەسەکاندا دەکەم، جار هەیە دوو، یان سێ مانگ چیرۆکێ لە مێشکمدایە و دامنەرشتووە، چونکە بەو شێوەیەی کە دەمەوێ بۆم نەکراوە دایرێژم، بۆ نموونە: من، چیرۆك بەس بە رووداو و کەسایەتی دانانێم، بەڵکو بە هونەری (گێڕانەوەو چۆنیەتی دەربڕین)ی ئەو شتەی لە مێشکمدایە. ئەو (تێڕوانینەی) کە هەمە بەرانبەر گەردوون و ژیان و مەرگ و..... تاد.

- بەو چەمکەی، کە خۆت تێی دەگەی، چیرۆك چۆن پێناسە دەکەی؟

- چیرۆك، دارێژراوی ناخی نووسەرە، رەنگدانەوەیەتی لەگەڵ دەرەوەدا، بەڵام پاش ئەوەی، کە وێنەی دەگیرێ و (هەزم) دەکرێ، لە مێشکدا (تەفاعولات)ی بەسەردا دێ، بەو شێوە هونەرییە ئەفرێندراوەی، کە تۆ دەتەوێ، دەیان چیرۆك لە مێشکمدا بوونە و تا ئێستاش، لەبارەی بابەتەوە لێیان رازیم، بەڵام تا ئێستا دامناون و دامنەرشتوونەتە سەر کاغەز، چونکە شێوازێکم بۆ نەدۆزیونەتەوە. ئێستە، بۆ نموونە چیرۆکی ترم لە مێشکدایە و بڵاوم نەکردۆتەوە، لەبارەی هەڵەبجەوە. پێشتریش چیرۆکێکم نووسیوە، لێ ئەمە دارشتنەکەی لە پەنای سێکسەوەیە، لە پەنای تەکنیکی ڤیدیۆوەیە، لە پەنای مردن و ژیان و گەردوونەوەیە، ئەمە زۆر ماندووی کردووم تا ئەو شێوەیەم بۆ دۆزیوەتەوە، کەچی چەند ساڵێکە لە مێشکمدا ماوەتەوە.

- تۆ پێتوایە چیرۆکی ئێستە، دابڕانێکی وای دروست کردبێ لەگەڵ چیرۆکی بابڵێین چل و سییەکانی سەردەمی (شاکر فەتاح و عەلائەددین سەجادی)، واتە ئەوانەی کە بە شێوەیەکی سەرەتایی دەیاننووسی موتەئەسیر بوون بە هەقایەتی میللی؟

- دەمەوێ، لێرەدا بێ درێژدادڕی، بەشێوەیەکی گشتی بچمە ناو باسەکەوە. باسی (لە خەوما) و ئەوانە ناکەم، ئەوە ئیشی من نییە و ئیشی رەخنەگر و بیبلۆگرافیستەکانە، بەڵام من دەیکەمە چوار قۆناغەوە، لە قۆناغی سەرەتا تا دەگاتە گۆڤاری (گەلاوێژ)، کە زۆر بە هونەریی نازانم، بەڵام هەموو نەتەوەیەك بەم شکڵە ساکارە دەستی پێکردووە، تاڕادەیەك لە گۆڤاری گەلاوێژی (١٠) ساڵدا، چیرۆکی کوردی هاتە سەر خۆی و دەتوانی پێی بڵێی چیرۆکە، بەڵام بەم چەمکەی ئێستەی سەردەمایەتی نا. قۆناغی دووەم، لە گەلاوێژەوە تا دەگاتە شۆڕشی چواردەی تەمموز، ئەوەش قۆناغێکە، لە ئەیلوولەوە، یان لە سەرەتای حەفتاکان بە تەئسیراتی گۆڤاری (شیعر ٦٩) و بەیانە سوریالی و دادائییەکان و.. بابڵێین قۆناغی (روانگە) -من لە روانگەش بیروڕای تایبەتی خۆم هەیە- ئەوەش قۆناغێکە تا ناوەندی هەشتاکان و لە نەوەدیش، لە راپەڕین بەولاوە، بە قۆناغێکی دادەنێم.

- باشە، ئەو دابڕانە لە چیدایە؟ خەسڵەتەکانی ئەو چیرۆکەی، کە دابڕینی دروست کردووە لەگەڵ کەلەپووری چیرۆکنووسیی پێش خۆی لە چیدایە؟

- دابڕان لە بابەت و لە داڕشتنیش و لە زمانیشدایە، لە شیعرییەتیشدا. بابەتی ئەوسا باسی دەربەگ و ژن بە ژن و.....تاد، چیرۆکەکانی ئیبراهیم ئەحمەد و عەلائەدین سجادی لەو بابەتانە بوون کەوا بە تەنگی میللەتەوە بوو، بەڵام لە حەفتاکان بەولاوە هەڵبژاردن لە بابەت هاتە کایەوە. ئەو هەڵوێستانەی، کە تێڕوانینی نووسەرەکە دەچەسپێنێ، ئەوانە لەلایەنی شێوەو بابەتەوە جیان. حەکایەتخوان و سەرەتاو لووتکە و هاتنە خوارەوە، ئەمانە مەبەست بوون، زۆرینەشیان مەبەستیان ئامۆژگاری و هەم کوردایەتیش بووە. چیرۆکنووسی ئەمڕۆ بۆ (کوردایەتی)ی نایکات،

دەیهونەرێنێ. دەیەوێ نیشانی بدا، کە ئەم هەڵوێستە هەیە و ئەمەش تێڕوانینی منە بەرانبەر بەو هەڵوێستە. ئەمە گۆشەنیگای منەو گۆشەنیگای تریش هەیە.

ئەمە هەمووی لەلایەنی ناوەڕۆکەوە. شێوەو رواڵەت، کە سوود لە تەکنیکەکانی (تەوژمی ئاگایی) کە خەڵك پێیدەڵێن تەوژمی هۆش، هەروەها مۆنتاژەکان: مۆنتاژی جێگە و زەمان و.. مۆنتاژی (لەفقی)ش هەیە، لە پاڵ کەڵك وەرگرتن لە زمانی سینەماو هەڵپەڕکێ (سەما) و شێوەکاری، بەتایبەتی لای من، بە زەقی دیارە، چونکە من سەرەتایەکی شێوەکاریم هەیە، دەمەوێ ئەو شتانەی، کە ناتوانم تەعبیری لێ بکەم بە زمانی پەیڤین، بە زمانی رەنگ گوزارشتی لێ دەکەم وەك لە چیرۆکی (چیرۆکنووس)دا، کە خۆم کردۆتە نموونە و لەوێ کۆتاییەکەم بە تابلۆیەکی بەناوبانگ و مەزن هێناوە، چونکە خۆم دەمامکاندووەو ویستوومە باس لە ئیعدام بکەم لە کەرکووك، بەوەی، کە ئیشارەتم بۆ ١٩٨٧/١/١٧ کردووەو هەم تابلۆکەی (گۆیا) کە بەناوی (٣ی مارتی ١٨٠٨)ەوەیە. هەموو چیرۆکنووسێ دەزانێ بەو کۆتاییە، کە دوو لاویان لە (رەحیماوا)دا کوشتووە. تەنانەت (رەئووف حەسەن) وتی: (ئای شەیتان من دەزانم لە کەکووك چی روو بدا، تۆ دەیکەی بە چیرۆك.) ئەوە لە ناچاریی سانسۆر بوو کردم، کە کەڵکم لە مێژووی چیرۆکەکە وەرگرت، کە دەکاتە رۆژی ئیعدامکردنیان.

- لە قسەکانی تۆ وا دەردەکەوێ ئەو دابڕانە هەیە. مانای ئەوەیە تۆ دان بەوەدا دەنێی، کە نوێخوازی لەناو چیرۆکی کوردی رووی دا؟

- بەڵێ رووی داوە. من، خۆم بە نوێنەرێکی ئەو نوێخوازانە دەزانم. لە سەرەتای حەفتاکانەوە دەستم کرد بە داڕشتنی ئەو چیرۆکانەی، کە لای خوێنەری ئەوسا نامۆ بوون، تەنانەت چیرۆکنووسێ، کە دوو سێ کۆچیرۆکی هەبوو، لە کۆڕی زانیاریی دەستی خستە شانم وت: (ئەم حەلەق و بەلەق و شتانە چییە تۆ دەینووسی!؟) دوای (١٠) ساڵی تر، هەمان نووسەر پێی وتم: (خۆزگە منیش بتوانم وەکو تۆ بنووسم.) منیش پێموت: (کەواتە من (١٠) ساڵ پێش تۆ کەوتبووم.) لەوانەش دکتۆر کاووس قەفتان و زۆری تر لە نووسەران. من، ئێستا، دوای راپەڕین نەختێ ساکاراندوومە،

کەچی خوێنەرانم، چیرۆکنووسان دەڵێن: (ئەرێ کاکە، بۆ بە زمانی ئەو وەختە نانووسی) وتم: (کاکە، زمانی ئەو وەختە جیا بوو، چونکە دەمامك و سانسۆر هەبوو. دەمویست شتێ لە پەنای ئەوەوە بڵێم. ئێستا دیموکراسییە.) ئەمە، نەختێ زەرەری بۆ لایەنی هونەری هەبوو. میللەتی کورد فێر بووە هەمیشە لە چەوسانەوەدا شتی باش دەنووسێ. من وای تێ دەگەم.

- راستگۆیی هونەری وا دەخوازێ، کە شاعیر و هونەرمەند و چیرۆکنووس لە چرکەساتی ئەفراندن و داهێناندا، ئەو چوارچێوە هونەرییەی، کە لە چرکەساتی دارشتن وەری دەگرێ، خۆی دایبرێژێ، ئیتر بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە، بیساکارێنێ، یان بیئاڵۆزێنێ، یان مەبەستی بێ، کە (وەرگێڕ)ان لەو حاڵەتەدا تا چ رادەیەك لێی قبووڵ دەکەن و لێی وەردەگرن، لێرەدا قەناعەتە هونەرییەکەی خۆت لە هەموو شتێ گرنگترە؟

- بەڵێ، قسەکەت زۆر جوانە و ئەم شتانە تێکرا هەن، چیرۆکنووس دەیەوێ شتەکانیشی بگەیەنێ، هیچ نەبێ بگاتە ئاستی ئەوانەی رۆشنبیرن، چونکە بە رای من ئەگەر بڵاوی نەکردەوەو لەسەر تەختە داینا هیچ ناگەیەنێ و تۆزی لێ دەنیشێ. من چیرۆکی وەهام هەیە. ئێمە نامانەوێ شتەکە بگەیێنین، هاوکات ئاستە هونەرییەکەی لەنگ بوو من هیچ شتێ نانووسم، بەڵام پێویستە ئێمە خوێنەرمان هەبێ هەرچەندەش کەم بن، دەبێ هاوسەنگی بکەین و ئەو هاوسەنگییە ٧٠٪ی بەلای هونەر و ئێستێتیکای چیرۆکنووسیدا بێ. من کێشەم ئەوە نییە خەڵك لێم تێناگات، بەڵام لە بەرژەوەندی ئەوان دەنووسم.

- لێرەدا مەبەستم ئەوەیە لە نووسینی هونەر و ئەفراندن و داهێنان پلانی پێنجیینە (خگە خمسیە) نییە تاکو تۆ بە شێوەیەکی مەدرووس چیرۆك دابرێژی، بۆ ئەوەی هونەرەکەی ساکارتر بێ، یان ئاڵۆزتر بێ؟

- بابەتەکەی لە مێشکتدایە خۆی بە دوای شێواز و تەکنیکەکاندا دەگەرێ، بەڵام کە گەیشتە تەکنیکێکی وا خۆی تێپەرێنێ و پێی قایل بێت، ئەوکاتە دایدەرێژێ،

بەڵام کە باسی ساکاریمان کرد، هیچ کاتێ من نامەوێ لە ساکاری کەم بکەمەوە، کە بە عەرەبی پێی دەڵێن: (السهل المُمتنع) هەموو کەسێ ناتوانێ ساکار بێ. ئەو ساکار نووسینە، تەجروبەی ٣٠ ساڵ ئەزموونی دەوێ تابتوانێ ساکار بنووسی. (پیکاسۆ) پاش دەیان ساڵ وتی: (من ئێستە بەو ئاواتەوەم، کە پێی نەگەی شتووم و بتوانم وەك منداڵێ نیگار بکێشم.) ئەڵبەتە ئەو ساکارییەش بۆ هونەرمەندەکە عەیب نییە.

- پێتوایە وەعی و ئەزموون پێش چرکەساتەکانی داهێنان بکەوێ؟

- چۆن؟

- مانای ئەو ئەزموون و رۆشنبیرییەی کە هەتە بەرانبەر بە چیرۆك، کە وەك خەزینێك لەلاتە، وات لێ دەکات زاڵ بێ و پێش ئەوە بکەوێ، نووسینی چیرۆکێ مەرجی خۆی بەسەرتدا بسەپێنێ، یان تۆ مەرجی خۆتی بەسەردا فەرز بکەی.؟

- لە ژیانی هونەری و ئەدەبیمدا، هەمیشە زاڵ و دڵنیابوومە لە هەموو شتەکان، بۆ هەر چ (بابەتێ) چووبێتم بە دڵنیاییەوە چووم لەبەر ئەوەی زەخیرەو هۆشیارییەکم هەیە، بۆیە زۆر دڵنیام و چی دەڵێم و چ دەکەم و چ تەکنیکێ بەکاردێنم. بڕوا بکە چیرۆکێ نانووسم ئەگەر تەکنیکی نوێ نەبێ لەلام، ئەگەر هیچ نەبێ لە زماندا گۆڕانێکم، یان حەفریاتێکی ئەرکیۆلۆژیم تێدا نەکردبێ. ئەمانە هەموو مەبەستن لەلای من.

- وەك موتابەعەی چیرۆکی تۆم کردووە، تۆ تاڕادەیەك چیرۆکنووسێکی ئەزموونگەری و خۆت لە تاقیکردنەوەکان بەدوور ناگری، هەوڵدەدەی شتەکان تاقی بکەیتەوە. لە قۆناغێکی زۆری ژیانی چیرۆکنووسیت، ئیشەکانت زۆر ئەزموونگەریی تێدابوو، تۆ بیانووت بۆ ئەم ئەزموونگەرییەت چییە؟

- من، تا ماوم، هەر ئەزموونگەرم، چونکە ئەگەر بڵێی ئەزموون تەواو بوو، مانای لە نووسین تەواو بووی. بەڵێ ئەبستراکتم بەکارهێناوەو ئەویش یەکێکە لە ئەزموونەکان، چیرۆکم هەیە بەناوی (ئەبستراکت Abstract)ەوە. شتێك، کە نەموێراوە بیڵێم، لەوێدا وتوومە.

- باشە ئێستە هاوسۆزیت لەگەڵ ئەزموونگەریدا ماوە؟

- بەڵێ، لەگەڵ ئەزموونگەریدا زۆر هاوسۆزم. خۆم لە ئەزموونگەر، ئەزموونگەرێکی (ریاچی) لە هەموو بەرهەمەکان، دەزانم بەتایبەتی بەرهەمە نوێیەکانم، لەوانە: (کاولاش) و (سۆناتای رۆح) هەمووی فانتازیایە. ئەزموونە لەگەڵ ئەبستراکتدا، لەگەڵ (غەرائبی)دا، کەسایەتییەکانم بەرز دەبنەوەو تەلیپاتی Telepathy دەکەن. لە فۆلکلۆریش کەڵکم وەرگرتووە: دایك، کە کچەکەی ماچ دەکا، لە شوێنەکەیدا خاڵ دروست دەبێ. لە دواییدا، کوڕ و کچەکە (هیوا و چیمەن) پەڕیان لێ دەردەچێ و دەبنە دوو کەناری و دەگەڕێنەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی کاولکارییەکان، بۆیە ناوم لێناوە (کاولاش) ئەڵبەتە، دوو خوێندنەوەی هەیە: خوێندنەوەیەکی ئاسایی وەك مرۆڤێکی ئاسایی و خوێندنەوەیەکی سیاسی، دەتوانی لەسەر زرووفی شەستەکاندا بیچەسپێنی.

- تۆ ئاماژەت بەوە دا، کە بەڵێ نوێخوازی هەیە و هەندێ لە سیماکانت دەستنیشان کرد بەوەی کە لە ناوەڕۆکەوە دەست پێدەکات تا زمان و لایەنی تەکنیك و شتەکانی تر و باسی خۆت کرد، کە یەکێکی لە نوێنەرانی ئەو رێبازە نوێیەی، کە لە چیرۆکی کوردیدا هەیە، کێی تر دەستنیشان دەکەی کەوا لەگەڵ خۆت نوێنەرایەتیی نوێخوازی بکات لە چیرۆکی کوردیدا؟

- ئەمە پرسیارێکی جوانە. چەند ساڵێك لەمەوپێش چوار کەسم دەستنیشان کرد، هەر ئەو چوار کەسەش دەنگی رەسەن بوون دوای من. لەوێ شێرزاد حەسەن، سەلاح عومەر و غەفوور ساڵح عەبدللا و جەلیل کاکەوەیس، ئێستا دەنگی نوێ هاتۆتە کایەوە، بە گوێرەی زەمەن لەوانە: (جەبار جەمال غەریب و کاروان عومەر کاکەسوور و ئارام کاکەی فەلاح و عەتا محەمەد) دەستنیشان کەم و جێگەی خۆیان گرتووە، دەنگی تریش هەن گەنجن و تاکوتەرا شتیانم خوێندۆتەوە، بەڵام ناتوانم بڵێم: جارێ دەنگن. هەرچەندەش ئومێدیان لێدەکەم ئەگەر واز لە دوو سێ لایەنی نووسین بهێنن. باسی ئەزموونگەریت کرد، من ئەزموونێکی نوێم هەیە لە چیرۆکی کوردیدا. رێبازی

(بریخت) که له شانۆدا دیواری چوارەم دەڕووخێنێ، ئەز له چیرۆکدا ئەوەم کردووه، بەڵام ئاماژەم پێ نەکردووه، کاتێ دەڵێم: (بەڵێ لەگەڵ تۆمه..) یان (ئەی تۆی خوێنەر...). له هەموو چیرۆکەکانمدا ئەوەم وتووه، یەکەم: خوێنەرەکه بهەژێنم بۆ ئەوەی بزانێ لەگەڵ ئەومه و بیر بکاتەوه، بیهەژێنم و ببینه سێ کوچکه... لەگەڵ مندا. نالێین: رەخنەگر و نووسەر و خوێنەر سێ کوچکەن، تەنانەت له (کاولاش)دا دەڵێم: (ئاسمان دەچوێنم به گولێکی مۆر) یان دەڵێم: (ئاسمان شووشه مەرەکەبێکی شینه) دوایی دەڵێم: (بەو وێنەیه، کاکی خوێنەر ئەگەر رازی نیت، دەخۆت وێنەی سێیەم و چوارەم دروست بکەو بەشدار به له گەڵمدا. دەنا دەمت بنووقێنه.)

- به نیسبەت خوێنەر، دەسەڵاتی خوێندنەوه بەشێکی گرنگ و تەواوکەره له داهێنان، ئایا تۆ له خوێنەری چیرۆکی کوردی رازیت؟

- تاڕادەیەك، ئەمه هەمووی ناگرێتەوه، ئەوەندەی من خەڵکان دەبینم باسی چیرۆکەکانم دەکەن، کەسانێك که چیرۆکەکانم دەخوێننەوه، تەماشا دەکەن پێوەندیی به کەسوکاریانەوه هەیه. له چەند کەسێکەوه هەڕەشەم بۆ هاتووه، یەکێ لەوانه دەڵێ: باپیرەی من له رۆمانی هەڵکشان بەرەو لووتکەدا، کەی دوو خانووی له جوولەکه کڕیوەو تۆ حەیای باپیری منت بردووه، هەروەها (دکتۆر نووری تاڵەبانی) ناڕازی بووه لەوەی، که له هەمان رۆماندا وتوومه که باپیرەی گەورەیان (شێخ ئەوڕەحمانی گەوره) چۆته حەج و گەڕاوەتەوه، شۆرباخۆرانی بەر تەکیه دەستیان ماچ کردووه، دوایی منارەکەش چەماوەتەوه دەستی ماچ بکا، ئەویش وتوویەتی: بەسه بەسه دەستمت ماچ کرد. ئەمه وەك ئەفساندنی بەشێك بوو. نامەوێ له نرخی کەس کەم بکەمەوه.

- تۆ له رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکه)دا رووداوی راستەوخۆت نەهێناوەو کردووته به هونەر و ئەو رووداوانه چوونەته ناو جیهانی هونەرەوه؟

- هونەراندوومه، له (هەڵکشان بەرەو لووتکه)، من (ده) ساڵ پێش ئێستا هەستم کرد، پێش هەموو کەسێ به حاسەی شەشەم هەستم کرد، که ئەم شارەمان خەریکه لەدەست دەچێ، بۆیه تۆبۆگرافییەکەیم تۆمار کردووه. داب و نەریت و گەڕەکەکان و

تێکۆشانەکەیم تۆمارکردووە، کە دوو خەتی سەرەکیی گرتووە: تێکۆشانی نەتەوایەتی و.. تێکۆشانی چینایەتی. بە زەقی نەبووە، هەندێکیانم هونەراندووە. پاڵەوانەکان (کەسایەتییەکان) هەندێکیان خۆمن.

- مانای ئەو برادەرانە مافی گلەییان نییە؟

- برادەرێك، راست و چەپێکی لە (هەڵکشان بەرەو لووتکە) داوە. ئەو دەڵێ: (هەموو شتێکە بەس رۆمان نییە). بەڵێ.. رۆمان هەموو شتێکە. قوتووی عەتاریشە، بەڵام سەیر لەوەدایە، ئەو برایە، ئایا رۆمانەکەی خوێندۆتەوە.

- ئەوە بابەتێکی ترە، کە بابەتی رەخنەیە لەسەر چیرۆکەکانت، دەتوانی دوایی قسەی لەبارەوە بکەی، بەڵام لێرەدا، مەبەستی سەرەکیمان خوێنەر بوو، خوێنەری کوردیی وا دروست بوون، کە بتوانن لە چیرۆکێکی نوێخوازانە، کە پڕ بێ لە رەمز و هێماو دەمامك و بونیادێکی ئەفسانەیی هەبێ، ئایا دەتوانێ لە چیرۆکێکی لەو جۆرە تێبگات؟

- بەڵێ زۆر گەشبینم، هەرچەندە رێژەیان کەمە، بەڵام هەیە لە هەموو وڵاتێکیشدا هەر وایە، تەنانەت لە وڵاتانی عەرەبی و لەلای فارسەکانیش، خوێنەرەکان چەند ئاستێکیان تێدایە و (٤-٥) ئاستن و خوێنەری داهێنەر پەیدا بوونە و چێژ لە تازەگەری و فانتازیا وەردەگرن.

- تۆ وەك چیرۆکنووسێ لە سەرەتاوە تا ئێستا کاریگەریی چ چیرۆکنووسێکت لەسەر بوو، بۆ نموونە لە بواری رۆماندا بەرهەمی کێت پێ باش بووە، کە بووبێتە هاندەرێك بۆت تا هەوڵ بدەی چاك بنووسی؟

- خوێندنەوەم زیاتر لە زمانی عەرەبییەوەیە. دەتوانم بڵێم لە ساڵانی پەنجاکانەوە زۆربەی ئەدەبی جیهانیم بەدەست دەکەوت. جاروباریش بە تورکی ئەوەی دەستم دەکەوت دەمخوێندنەوە، بەتایبەتی لە گۆڤاری (کتابی)ی حیلمی مراد دا، ئەگەر دەقە رەسەنەکانم نەخوێندبێتەوە، هەندێکم پاچڤە دەکردە سەر زمانی کوردی، ئەمە هەتا حەفتاکان سەرەتا بوو، رۆمانم دەخوێندەوەو شیعر کەمتر، هەرچەندە دەمشیعراند.

(چیخۆف) و (دیستۆیڤسکی) و (موپاسان) و (ئیدگار ئالآن پۆ) و (تۆلستۆی) ئەمانەم تا حەفتاکان دەخوێندەوە، دوای ئەوە کە ئاشنا و شارەزای ئەدەبی نوێ بووم، تەعاروفم لەگەڵ ئەمەریکای لاتینی کرد، بەگشتی (مارکیز) و (ئامادۆ)... و (کولّی ویلسن) و ئەمانە. هەروەها ئەدەبی ئەفریقیایی چ ئەنگلۆساکسۆنی بێ چ فرانکفۆرتی بێ ئەویش تاکوتەرا لە گۆڤاری (ئاداب)ی لبنانی و گۆڤارە میسرییەکان و گۆڤاری چیرۆکی تونسی و (الکلمە) کەڵکم وەرگرتووە.

- لە چ روویەکەوە کەڵکت وەرگرتووە؟

- بۆ نموونە: بەدوای تەکنیکەوە دەگەڕام، یان شێوەی دارشتن، بەتایبەتی ئەدەبی چیرۆکنووسین لە مەغریبی عەرەبی لە میسر و عێراقیش پێشکەوتووترە، ئەوە پەیوەندیم لەگەڵ ئەو چیرۆکانە هەبوو. کۆمەڵێکی زۆر لەو چیرۆکانە و گۆڤارانەم دەخوێندەوە، کە تەکنیکی نوێیان تێدا هەبوون، مەبەستم بەهۆی ئەوانەوە، منیش دارشتنی نوێ بدۆزمەوە.

- باسی هەندێك چیرۆکنووست کرد، خۆشت یەکێکی لەوانەی هەوڵ دەدەن نوێخوازی بۆ چیرۆکی کوردی دابمەزرێنی و سیمایەکی بۆ دارێژن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشەوە، زۆر هەن، کە ناویان چیرۆکنووسە، کەچی زۆر بە سەقەتی لە هونەر و پەیامی خۆیان تێگەییون، ئێستەش واتێدەگەن چیرۆکنووسین بریتییە لە عەریزە نووسین، موخاتەبەیەکی راستەوخۆی جەمهوری خۆیان دەکەن، یان واتێدەگەن مۆنۆلۆگ و دیالۆگ و ئەمانە لە چیرۆك ئەوەیە، کە تۆ کەوانەیەك بکەیتەوە کابرا لەبەردەمی خۆیەوە قسە بکات و بەدەنگی بەرز قسە بۆ ناخی خۆی بکات، یان داشێ دابنێ و بڵێ دایەلۆگم دروست کردووە. بەڕای تۆ، ئەمانە بە باری سەلبی ناکەونەوە لەسەر رەوتی چیرۆکی کوردی و شێواندنی پەیامەکەی؟

- ئەم پرسیارەی تۆ پرسیارێکی زۆر بەجێیە، هەرچەندە چەند تەوەرێکی گرتووەو هەوڵدەدەم وەڵامیان بدەمەوە.

تەوەری یەکەم: ڕێبازێکی نوێ لە چیرۆکی کوردیدا پەیدا بووەو هەیە و هەن، بەڵام چیرۆکنووس هەیە هەندێ چیرۆکی باشە، بەڵام لێرەدا، گرێی خۆ بە کەمزانین هەیە، ئەویش پەیوەندیی بە گرێی ترسی ئۆدیبەوە هەیە. نووسەری کوردی ئێمە وادەزانێ خۆی کەمی کردووە، بۆیە خۆی لەگەڵ شاکارترین ئەدەبی جیهانیدا بەراورد دەکات، دەشتوانین و.. نموونەی زۆر چاکمان هەیە، کە بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەدەبی جیهانیدا، هیچ گرێمان نییە و چیرۆکمان هەیە، کە وەری گێڕینە سەر زمانەکانی دی و بچێتە قاڵبی ئەدەبی جیهانی. چیرۆکنووسێکی پلە یەکی لای ئێمە بەرانبەر چیرۆکنووسێکی پلە حەوتی ئەوروپایی، یان ئەمەریکای لاتینی ئەژنۆی دەشکێ. وابزانم ئەمە ڕاست نییە، یان حەز دەکا ڕەخنەگرێکی ئەورووپی تەنانەت عەرەبی لەسەری بنووسێ، بەڵام ڕەخنەگرێکی کورد یان بونیادگەرییەکان ئەگەر جوانتریش بنووسن سەرنجیان ڕاناکێشێ. ئەمە خۆی لە خۆیدا نەخۆشییەکە. هەندێك هەن بەردەوامن و دەنووسن و پێیان وایە، کە تەنیا دەیانەوێ ناویان لە ئارادا بێت. وابزانم ئەدەب قۆناغە، وەك مەیدانی پێشبڕکێ وایە، ئەسپ هەیە ڕەسەنە و زیاتر ڕادەکا، ئەسپیش هەیە هەر لە سەرەتاوە دادەنەوێ. وابزانم ئەمانە دەبێ خۆیان و جەمهوریش بناسن و وازبێنن باشترە لەوەی تەنیا -وەك جەنابت فەرمووت: حیکایەتخوانی بکەن- چیرۆك، حیکایەتخوانی نییە، بەڵکو هونەری گێڕانەوەیە، هونەر و تەکنیکە. بۆچوونە بەرانبەر بە گەردوون و لۆگۆس و جوانی و هەقپەرستی.

تەوەری دووەم: ئەگەر عەریزە نووسین بێ و کەوانەیەك، یان داشێ (-) دابنێی گوایە فلاش باکت کردووە، یان نموونەت هێناوەتەوە، بەم شێوەیە نابیتە چیرۆکنووس.

- لەبارەی محەلییەت لە چیرۆکی کوردیدا، ئێستاش زۆر لە چیرۆکنووسان وا تێگەییوون، ئەگەر چیرۆکنووس باسی بێشکە بکات، یان باسی بەڕە و جاجمی کوردی و کاسە و کەوچکی کوردی بکات، ئەوە چیرۆکی کوردیی خۆماڵی نووسیوە، لەکاتێکدا پێموایە محەلییەت لە چیرۆکدا ئەوەیە تۆ بتوانی بیر و بۆچوون و شێوەی بیرکردنەوەو تەسەوراتی مرۆڤی کورد بەرانبەر بە وجوود و دەوروبەری خۆی و سروشت بەرجەستە

بکات. تۆ یەك لەو چیرۆکنووسانەی، کە هەندێ چیرۆکت هەیە محەلییەتی تێدایە و هونەریشە، لەوانەش: (برایم شۆڕاوی) یان (سەعات ٨.٣٠ی بەیانی و ٨.٣٠ی شەو)ت هەیە، کە لەو چیرۆکانەن لەبیر ناکرێن، هەروەها لە رۆمانەکانیشتدا سوودت لە محەلییەت وەرگرتووە، چۆن لەو دیاردەیە تێدەگەی؟

- سوپاست دەکەم، کە باسی ئەو دوو چیرۆکەت کرد. لە دیداری یەکەمی چیرۆکی کوردی یەکەمیانم لە (سەری رەش) لە پاڵ چەندین چیرۆکنووسی تر خوێندمەوە، بەڕای رۆژنامەنووس و رەخنەگران یەکەم چیرۆك بوو کە پاداشت کرا. (برایم شۆڕاوی) لە دیداری دووەمی چیرۆکی کوردیدا دیسان بەڕای رەخنەگران بە یەکەمین پاداشت کراو زۆریش ئاماژەی بۆ کرا. ئینجا با بێینەوە سەر خۆماڵییەتی، بەڵێ من زۆر پەنام بۆ خۆماڵێتی برد بەو مەرجەی رەگ و ریشەی خۆم بناسم، ئەگەر خۆم نەناسم، ئەگەر رابردووم نەبێ، نە ئێستەو نە داهاتووم نابێ، لەبەر ئەوە دێم کەڵك لە کەلەپووری خۆمان وەردەگرم، لە فۆلکلۆرمان و لە داب و نەریتمان، نەك وەك ئەوەی ئاماژەت پێدا، کاسە و کەوچك و جلوبەرگ و ئەوانە، هەرچەندە ئەوانیش سیمایەکن، بەڵام سەرەکی نین. بەڵێ، ئەگەر بڵێی مرۆڤی کورد لەگەڵ مرۆڤێکی ئەوروپا جیا بکەیتەوە، ئەو سویلەو پانتۆڵی لەبەرە، من دەڵێم ئەو وەختە کەسایەتیی کورد و بیر و بۆچوونی بەرانبەر بە گەردوون و سێ تابۆکەی (سێکس و ئاین و دەسەڵات). ئەمە هەمووی کەسایەتیی نووسەرەکە پێکدێنن. کورد خوێنی گەرمە. لە رەفتارێکی سێکسیدا یەکسەر پەلاماری کوشتن دەدا. دەتوانی بەمە دەربببڕی، بەڵام نەك وەك خۆی کە هەیە، بەڵکو بە (تەوزیف) بۆ داهاتوومان دایمەزرێنی، ئەمە بەلای منەوە خۆماڵێتی و کەسایەتیی چیرۆك نیشان دەکات.

- هەر بە موناسەبەی باسکردنی محەلییەت لە چیرۆکی کوردی، هەندێ بە پێچەوانەی ئەوەی، کە ئێستا باسمان کردن، پێیان وایە ئەگەر بازبدەی بەسەر موعاناتی مرۆڤی کورد و بەسەر هەموو ئەو کێشەو گرفتانەی مرۆڤی کورد رووبەڕوویان دەبێتەوە، یان بازیدا بەسەر واقیع و هەموو ئەو سیمایانەی چیرۆکی کوردی پێکدێنن،

چیرۆکێکی نووسی، کە دوور بوو لەو وەزعە بە بۆچوونی ئەو پێیوایە ئەمە چیرۆکی جیهانیی نووسیوە، تۆ تەفسیرت بۆ بە جیهانیبوونی چیرۆك چییە؟

- زۆر جوان ئاماژەت بۆ دوو دەراوێژ کرد، کە تۆ بە دیاردەت دانا، من بە نەخۆشیی دەزانم. با لایەك لەوانە بکەینەوە، کەوا بە ساکارانە وادەزانن فۆلکلۆر دابرێژن و حیکات ئامێزی بکەن گوایا ئەوان خۆماڵێتی دەکەن. ئەوانەشی، کە ئاماژەت پێدان، وادەزانن جیهانیبوون کەسمۆپۆلیتییەتە ئەگەر باز بدەن بەسەر داب و نەریت و لایەنی نەتەوایەتی و زۆر شتی تر، کە ئەویش هەڵەیە. بۆچوونی من لەبارەی خۆماڵێتی ئەوەیە کەڵك لە هەردوولا وەردەگرم، لایەنی کۆمەڵایەتی ئاسانە، بەڵام سەردەمایەتیش هەیە، ئەگەر توانیمان تەجاوزێك لە نێوان ئەو دوو لایەنە بکەین. وابزانم چیرۆکی کوردی لە پێشەوە دەبێ. فەرموو نموونەمان زۆرە لە ئەمەریکای لاتین و لە ئەفریقیا و لە ژاپۆن، هەموو کەلەپووری خۆیان بەشێوەیەکی سەردەمایەتی دەرخستووە. ئایا کەلەپوور و سەردەمایەتی (المعاصرە) عالەمییەت نییە؟ بەلای منەوە، ئەوانەی خەلاتی نۆبڵیان وەرگرتووە، لە سەرەتاوە تا ئێستا ئەو کەسانەن، کە بەزۆری هەڵقوڵاوی محەلییەتی خۆیانن، مەبەستم لە رۆماننووس و چیرۆکنووسەکانە. ئەدەبێکی جیهانی نییە لای من، ئەدەبێکی تەسکی مەحەللی هەیە، کە شاکار و جوان بێ، ئەوە خۆی جیهانییە.

- چیرۆکنووس ئەگەر خۆی هونەرمەند بوو، دەتوانێ هەڵسوکەوت لەگەڵ کەرەستەکانی بەردەستی بکات و بیکاتە شتێکی جیهانی. ئێستا (ئەلیخۆ کاربنتیر) یەکێکە لەوانەی کە لە ئەمەریکای لاتین، بۆ نموونە شتی خۆماڵییەوە، واتا گەڕان بەدوای ئامێری مۆسیقای میللیی گەلان، رۆمانێکی نووسیوە بەناوی (خگوات چائعە) سەرنجی خەڵکی دنیای راکێشاوە. زۆر لەو حاڵەتانەی، کە ئێستا لە ئەمەریکای لاتین دەبینرێن هەموو ئەوانەن، کە لە کەرەستە خۆماڵییەکانەوە دەستیان پێکردووە، بەڵام چونکە هونەرمەندانە و ئینسانییانە تەعامول لەگەڵ ئەو کەرەستانە دەکەن، بۆیە سەرنجی رەخنەگرانی جیهانیان راکێشاوە. من لەو بڕوایەدام، چیرۆکنووس ئەگەر بتوانێ

له قووڵایی ئینسان بدات، وەك زۆرجار دەبینی چیرۆكی (مردنی فەرمانبەرێ)، (عەرەبانچی)، (پژمین) ئەمانە ئەدەبی چیخۆڤن، لەبەر ئەوەی لە ناخی ئینسانیمان دەدەن، بۆیە چ وەك خوێنەر، یان رەخنەگر، یان وەك چیرۆكنووس و خەڵكی ئاسایی چێژی لێ وەردەگرین. ئایا بەلای تۆشەوە وانییە، كە ئەم قسوورە لەوەدایە، كە چیرۆكنووسی كورد زۆریان نەیانتوانیوە لەو قووڵاییە ئینسانییەمان بدەن؟

- ئەم بۆچوونانە جوانن و سەد دەر سەد تەریبە لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی من تەواوە، كە تۆ دەڵێی سەرنەكەوتوون، ئەوانە خۆیان ئەدەواتی هونەرییان نییە. بۆ نا، دەتوانین هەموو كەرەسەكانمان بەكاربهێنین، كەلەپوورمان، ئەفسانەكانمان، من چیرۆكەكانم دەئافسێنم، ئەگەر ئەم زاراوەیە بشێ بەكاربێنم، وەك (ماركیز)یش بە (غەرائبی) ناودەبرێ، لای ئێمە واقیعەكە خۆی سەیرە، نامەنتقی و سیحرئامێزە. لە هەولێر شتێك باس بكەم نامەنتقییە بچم لە ئەوروپا بیگێڕمەوە، لەوێ غەرائیبییە. ماركیز دەڵێ: (ئەمڕۆ شۆربای بەبەغامان خوارد) بەلای ئێرەوە سەیرەو بەلای ئەوانەوە ئاساییە، یان لە ئەمەریكای لاتین وەك ماركیز لە (سەد ساڵ لە دوورەپەرێزی)دا باسی بەفر دەكا، ئەوانە ئاساییە، ماركیز هاتووە تێكەڵاویی لەنێوان زەمەنەكان كردووە، باسی رووداوێك دەكا، كە ئەمڕۆیە، رووداوێكی تری پێوە بەستاوە، تۆ وادەزانی دیسان ئەمڕۆیە، كەچی باس لە دوو سەد ساڵ لەمەوبەر دەكا، یان باسی ئەوە دەكات یەكێ موگناتیس بە كۆڵاناندا رادەكێشێ، هەموو كاسە و كەویلی خەڵكەكەش رادەكێشێ. لەگەڵ ئەوەشدا، كاسە و كەویلی ئەو عالەمە ئاسن نییە. پلاستیك و فافۆن و ئەو جۆرە شتانەیە، بەڵام ئێمە پێمان قبووڵە، چونكە ئەفسانددوویەتی.

- تاڕادەیەكی زۆرو تا ئەم ساڵانەش چیرۆكی كوردی، بەتایبەت ئەوەی پاش حەفتاكان، نووسەرەكان بڵاویان دەكردنەوە، بەوە تاوانبار بوون، كە لەژێر كاریگەریی تەوژمی بیر و فەلسەفەی عەبەسییەت و وجودییەت چیرۆك دەنووسن. چیرۆكنووسانی وەك: ئەلبێر كامۆ و سارتەر و ئەوانە دەخوێننەوە. ئەو گروحاتانە لە چیرۆكەكان رەنگ دەداتەوە، پێتوایە شتێكی وا (تەبەلور)ی كردبێ لە ناو چیرۆكی كوردی، تا بەو زەقییە

تاوانبار بکریٚ، له کاتێکدا (عەبەسییەت) و (وجودییەت) فەلسەفەن و ڕێبازی فەلسەفین، ئەگەر شتێکی وا هەبوو دەچێتە ژێر ناوێکی تر، کە پێی دەڵێن ئەدەبی لامەعقوول، تۆ شتی وا لەناو چیرۆکی کوردی دەبینی؟

- بەڵێ، سەرەتای حەفتاکان با بکەین بە نموونە و سەرەتای (روانگە) و بەهاوشان لەگەڵ روانگەدا، ئێمەی نووسەرانی نوێخواز، پێش روانگەش دەستمان لە نوێخوازی دابوو وەك: (لەتیف حامید)ی و (لەتیف هەڵمەت) و (ئەحمەد شاکەلی) و (سەلام محەمەد) و من. هەرچەندە هەندێکمان روانگەیی و هەندێکمان روانگەیی نەبووین، لەم بارەیەوە من، رای تایبەتی خۆم هەیە، بەڵام هەموو سەرەتایەکی ئاوا تێکەڵ دەبیٚ لە نامەعقووڵ و لە سریالیزم و لە دادیزم و لە وجودییەت و لە عەبەسییەت، هەتا لە سەرەتاکانی راپەڕینیش، من دیاردەیەکی عەبەسی دەبینم، چونکە خەڵکەکە قۆناغەکە هەزم ناکەن، خۆم بە نموونە دەهێنمەوە، کە لەبەر خوێندنەوەی زۆری وجودیی سارتەری و کامۆیی و پاشان وجودیی نویٚ-من بە وجودییەت دەڵێم: (بوونایەتی) وجودیی تازە لای (کۆڵن ویلسن)- زۆر کەس بەلایەوە سەیر بوو، کە لە شەستەکاندا کۆڵن ویلسنم ناسیوەو تەعلیقیشم لە پەراوێزی کتێبەکانی داوە، لەو کاتەدا کەم کەس کۆڵن ویلسنی دەناسی. من، خۆشم پێیان موتەئەسیر بووم، بەڵام تەوزیفم کرد بۆ دارِژتنی چیرۆکی نوێی کوردی. چیرۆکنووس بە مەزهەب نانووسیٚ، وەلیٚ کەڵك لە هەموو ڕێبازو مەزهەبەکان وەردەگریٚ بۆ ئەوەی چیرۆکی هونەریی کوردی دامەزرێنیٚ.

- لە سەرینی ئەم قسانەوە، کە کردمانن تۆ خۆت وەك چیرۆکنووسێك بە قەرزاری کام لە نووسەرە جیهانییەکان، یان عەرەب و تورکەکان دەزانی؟

- زیاتر قەرزاری نووسەرە کوردەکانم ئەوجا عەرەبەکان، وەك زمان قەرزاری هەموو ئەوانەی پێشووم وەك: (محەرەم محەمەد ئەمین) و (محەمەد مەولوود مەم) و (کاکەی فەلاح) و (حەمە ساڵح دیلان) و (کامەران موکری) و نووسەرانی گەلاوێژ. من لە رۆژنامەی (خەبات) دا لە ١٩٥٨-١٩٥٩ بە عەرەبی دەمنووسی. لە رووی زمانەوە کەڵکم لەوانەوە وەرگرتووە، بەڵام هیچ کەڵکم لە بیروباوەڕ و تێڕوانینیان وەرنەگرتووە و

به ساکارم دەزانین، تەنانەت کاکەی فەلاح، محەرەم محەمەد ئەمین، گۆشەنیگای خۆیان بەرانبەر من بڵاوکردۆتەوە، دەڵێن تۆ لەگەڵ کاکەمەم بۆتانی تازەگەرن و کەڵکتان لێ وەردەگرین. ئەم رایانەیان، کە لە رۆژنامەی (بیری نوێ)دا بڵاو کراونەتەوەو لەلام هەڵگیراون. دێینە سەر نووسەرانی عەرەب، لە میسرییەکان و عێراقییەکانم زۆر خوێندۆتەوە. من موعجبم بە (جەبرا ئیبراهیم جەبرا) وەك تەکنیك، بەڵام وەك پۆلەتیکای بیروباوەڕ لە گەڵیا نیم. موعجبم بە چیرۆکنووسانی میسر، بەڵام (نەجیب مەحفووز) نا، چونکە تەنیا بە دارِشتنی موعجبم (جەمال ئەلغیتانی) هەرچەندە بیروڕای خۆم بەرانبەری هەیە، چونکی لە دژی کورد شتی نووسیوە. بەتایبەتی موعجبم بە چیرۆکنووسانی باکووری ئەفریقیا (محەمەد زەفزاف) و (رەشید بوجدرە) شتی جوانیان هەبوو، ئینجا دێمەوەو ئیعترافێك دەکەم وەك (جان جاك رۆسۆ) لە سەرەتای نووسینمدا، لە حەفتاکاندا، خەمی من ئەوە بوو، کە کوردیم نەدەزانی، لیستێکم دەکرد بۆ ئەو چیرۆکەی کە دەمنووسی، تا بزانم چەند دێڕ و رستەی کوردیی پەتی تێدایە، بەهۆی ئەوەی لە کەرکووك دەژیام.

- لە شیعری کوردیدا، قۆناغی تێپەڕاندنی کلاسیکییەتی نوێ کە تەحدید کراوە بە ماوەی دەستپێکردنی (شێخ نووری) و (گۆران) و (پیرەمێرد) کە شیعری نوێیان هێنایە پێشەوە، هەریەکە بەپێی توانای خۆی رووپێوێك لەو نوێبوونەوەیەی بە بەر دەکەوێ، ئایا نوێبوونەوەیەك بەو قەبارەیەی (شێخ نووری) و (گۆران) و (پیرەمێرد) کە لە شیعردا کردیان بەدی دەکەیت کە لە چیرۆکی کوردیدا کرابێ و بتوانی بە جورئەتەوە پێم بڵێی کێ نوێنەرایەتیی دەکات؟

روونتر: ئەوان ئەوسا خۆیان لە مەورووپی پێش خۆیان جیاکردەوە، هاتن ئیعلانی جووڵانەوەیەکی نوێیان کرد بە کۆمەڵێك چەمکی نوێوە، نموونەی خۆیان خستۆتە روو بۆ نموونە: (شێخ نووری) چەپکێ شیعری خستە روو، کە نوێنەرایەتی رۆمانسییەت لە شیعری کوردی دەکەن، کە من بە چەرخی تەنویری کوردیی ناودەنێم، ئایا لە چیرۆك بەهەمان هێز توانراوە شتێك بکرێ وەك شێخ نووری و گۆران لە بواری شیعر کردیان؟

- بەڵێ راستە (شێخ نووری) و (گۆران) تارادەیەك (پیرەمێرد) دابڕانیان لەگەڵ رەوتی پێشوویاندا دروست کرد و زمان و وێنە و دارشتن و بۆچوونیشیان جودا بوو، ئەوە لەلایەنی شیعریدا بووە بڕگەی دووەمی پرسیارەکەت، کە دەفەرمووی لە چیرۆکدا، بەڵێ.. باشترین نموونەی دابڕانی لەگەڵ چیرۆکی پێشووتر و بەتایبەتی، کە لەگەڵ چیرۆکەکانی سەردەمی (گەلاوێژ)دا هەبێ (شێخ مارف بەرزنجی)یە، چونکە ئەو وەختە تەوژمی ئاگایی (تیار الوعی) بەکارهێناوە، پاش ئەو (محەرەم محەمەد ئەمین) دێ، دوای ئەویش (محەمەد مەولوود مەم) دێ، بەڵام لەو قۆناغەدا (مارف بەرزنجی) لە هەموویان سەرکەوتووتر بوو.

- ئەی دوای ئەمان تەوژمێکی تر هات (حوسێن عارف) کە لە ١٩٥٧وە لە (چای شیرینەوە) لە پێشبڕکێی گۆڤاری (شەفەق) ئەویش ئامادەبوونی بۆ خۆی پەیدا کردووە.

- وابزانم (حوسێن عارف)یش هاوچەرخی ئەم ناوانەیە (کاکەی فەلاح) و (محەمەد مەولوود مەم) و (مارف بەرزنجی) و (محەرەم محەمەد ئەمین) ئەو سەردەمەی حوسێن عارف (چای شیرین)ی بڵاوکردەوە منیش پەیوەندیم بە شەفەقەوە هەبوو. بۆ ئەو سەردەمە (چای شیرین) چیرۆکێکی باش بووە، بەڵام هیچ تەکنیکی هونەریی تێدا نەبوو، نازانم لەبەرچی بوو خەڵاتی یەکەمی وەرگرت؟ من ئاگادار نیم لەوەی چیرۆکەکانی تر چی بوونە. بابەتی (چای شیرین) کە زۆر ساکار بووە، کچێك حەز لە کوڕێك دەکاو چای شیرینی بۆ تێدەکا. ئەمە هیچ تەکنیکی هونەریی تێدا نییە. ئەگەر کاك حوسێن لێمی قبووڵ بکات، بەڵام لەو دەمەدا، ئەو رەخنەگرانە، یان ئەوانەی هەڵیانبژاردووە، چەند چیرۆکێکیان لەبەردەست بوو و ئەمەیان لەبارترینیان بووە.

- زۆر کەس (کلافەیەك ژانی تووڕە) بە گۆڕانکارییەکی مەیدانی چیرۆك دادەنێ بەتایبەتی لەپاش ساڵانی حەفتا، ئایا تۆ ئەو رایە دەسەلمێنی؟

- (کلافەیەك ژانی تووڕە) بەڵێ گۆڕانکاری بوو، بەڵام هەموو چیرۆکەکانی ناگرێتەوە.

- تۆ وەك چیرۆكنووسێ كە هاجسی داهێنانت تێدا هەیە، كە چیرۆكێكی جوان، یان رۆمانێكی جوان دەخوێنیتەوە، تووشی نائومێدی نابی بەوەی، كە خۆت بەرهەمتهێناوە؟

- نەخێر، تووشی نائومێدی نابم. گەشبینم، بەڵام لە دڵی خۆمەوە دەڵێم: فلان چیرۆكم خوێندۆتەوە، چیرۆكێكی باشە، ئێوەش بیخوێننەوە. گوێ نادەمە ناویشی. چیرۆكێكی زۆر نایابم خوێندۆتەوە نووسەرەكەی نەناسراویشە.

- هەست دەكەم رۆشنبیری كوردی بەگشتی، چیرۆك بەتایبەتی تووشی قەیران بووە، واتا تا چیرۆكێكی جوان دەخوێنیتەوە، چەندان كۆچیرۆك، یان دەیان چیرۆكی خراپ دەخوێنیتەوە، بەڕای تۆ بۆ رزگاركردنی چیرۆكی كوردی لەو قەیرانەی كە تێی كەوتووە، چی بكرێ باشە؟

- یەكەم: با لە دیاردەكە بدوێین. دیاردەیەكی زۆر ئاسایی و سروشتیشە. چیرۆكی جوان و دانسقە هەبێ، لە پاڵ ئەوەدا، چیرۆكی مامناوەندی و خراپیش دەبێ، ئەمە لە هەموو شوێنێكی جیهاندا هەیە و كەس ناتوانێ ببێتە سانسۆر و بڵێ ئەم چیرۆكە باشە و ئەوە چاك نییە، ئیتر رێژەیی و میزاجە، هی وا هەیە، چیرۆكی من ناخوێنێتەوەو چیرۆكە زۆر خراپەكەی بەلاوە پەسندە. ئەمە حاڵەتێكی باشە، بەڵام بۆ تەكاندان و پێشخستنی چیرۆكی هونەریی چاك، ئەوە دەبێ وەزارەتی رۆشنبیری بەرهەمی چاك چاپ بكات و گۆڤارەكان گرنگیی پێبدەن. من كە لە گۆڤاری (كاروان)دا كار دەكەم، هەست بە قەیرانی چیرۆك دەكەم. گۆڤار، یان رۆژنامە پێویستیی بە ئازووقەی خۆی هەیە و دەبێ بیدەیتێ. بە نموونە ٥-٦ چیرۆكم رەفز كرد، یەكەم لەگەڵ خاوەنەكانیان تووشی كێشە هاتم، هەروەها لەگەڵ سەرنووسەرەكەش دیسان تووشی كێشە هاتم! ئەو دەیوت: ئەگەر ئێمە هەموو ئەوانە رەفز بكەین، ئەی چی بڵاوبكەینەوە؟ ئەم حاڵەتە هەیە، بەڵام چیرۆكی چاك و خراپ و مامناوەندی، هەریەكەیان خوێنەری خۆیان هەیە. ئێمە چیرۆكی باشمان هەیە، كە دەتوانین وەریانبگێڕینە سەر زمانەكانی بێگانە و دراوسێ...

- پێڕەوکردنی تەکنیکی نوێ، چەند خزمەتی چەمکە نوێیەکانی چیرۆکی کوردی کردووە؟

- چیرۆکی نوێ، تەکنیکەکانی نوێیە: تەوژمی ئاگایی-جێگە- مۆنتاژی لەفزی و زەمەنی و مۆنتاژی سینەمایی و.....تاد، چیرۆکی نوێی کوردی لەسەر ئەوانە دامەزراون. کەڵك وەرگرتن لە زانستەکانی تر، لە زمانی هێڵ و رەنگ، لە سینەماو هەڵپەڕکێ (سەما)، تەنانەت تەکنیکی بێدەنگی، زمانێکە لە زمانەکان. بەهۆی چیرۆك و رۆمانەکانم، وابزانم باسم لە شتی نوێ کردووە. یەکێك لە سیماکانی رۆمانی نوێ ئەوەیە پاڵەوانەکان (کەسایەتی) خۆیان لەناو رۆمانەکەدا، باسی رۆمان دەکەن. لە رۆمانی (کاولاش)دا، ئەوەی دەیگێڕێتەوە، خۆی رۆماننووسە، دەڵێ: ئەمڕۆ چووم بۆ کۆبوونەوەیەکی چیرۆکنووسین لە سلێمانی، وامان گوت و وامان کرد. ئەمە هەنگاوێکە بەرەو پۆست مۆدێرنیزم.

- باسی ئەوەمان کرد، کە چیرۆکی نوێ خۆی تەکنیکی نوێ دێنێ، بەڵام هەیە تەکنیکی نوێ بەکادرێنێ، بەڵام چیرۆکێ نانووسێ، کە کارتێکردنی بەسەر خوێنەرەوە هەبێ، یان بە عەقڵییەت و چەمکی نوێ هەڵسوکەوت لەگەڵ چیرۆك ناکات، کە خۆی ئەسڵەن هونەرەکە هونەرێکی نوێیە، هاتووە سوود لە (تەوژمی ئاگا) و (مۆنتاژی زەمانی و مەکانی) و ئەوانە دەکا، بەڵام چیرۆکەکەی نەیتوانیوە رەگەزە گرنگەکانی تری چیرۆکی تێدا کۆبکرێتەوە.

- ئەگەر بەڕاستی کەسێك لە هونەرەکانی چیرۆکی کوردی تێگەیشتبێ و ئەو بنەمایانەی کە باست کردن بزانێ دیارە قەیرانێکی تری هەیە، کۆی هەموو شتەکانی تێدابن، ئەی کوا فیکرو کوا تێڕوانینی بەرانبەر بە گەردوون و...؟

- وای تێدەگەم لێرەدا ونبوونی (روئیا) هەیە. دووەم رەنگە ئەزموونێکی بە پیت بە بژوێنی نەبێ، چ ئەزموونی ناو ژیان، یان هی ناو کتێب، دەبینی خوێندنەوەی هەیە، لە سیناریۆ دەزانێ، لە بابەتی تەکنیك و ئەوانە دەزانێ، بەڵام رۆمانی زۆری نەخوێندۆتەوە، چیرۆکی باش ناخوێنێتەوە.

- قەیرانەکە وەك ئاماژەت بۆ کرد، راستە نەبوونی روئیایە. ئەزموونی هەیە، بەڵام ئەزموونەکەی زۆر قووڵ و خەست نییە، یان دەخوێنێتەوەو هەزمی ناکاو ئیستیعابی مەسەلەکان ناکات. خوێندنەوە ئیستیعابە. بەردەوامیی خوێندنەوەش وەك وەرزشە بۆ مێشك. دابڕان لە رۆشنبیری دابڕانە لە روئیا و ئەزموون. نووسەر دەبێ دەیان کتێب بخوێنێتەوە ئینجا بتوانێ شتێ بنووسێ.

- پێموایە هەندێ لەو نووسەرانە موعجبن بە توێکڵی نوێخوازی، واتە شێوەو دیوی دەرەوە، نەك لە جەوهەری نوێخوازی تێبگەن؟

- بەڵێ، ئەو شکڵانییەتە هەیە، بەتایبەتی لە سەرەتای حەفتاکاندا رووی دا. من، تووشی ئەو نەخۆشییە هاتم، بەڵام لە پاشاندا خۆم دۆزییەوە. شکڵەکە تا ئەو رادەیە باشە، کە خزمەتی روئیاکەت بکات، بەڵام کە خزمەتی نەکرد، ئێمە ناشکلێنین. هەیە بە پێچەوانەوە بابەت بەلایەوە گرنگە، لە تۆ وایە رووداو و مێژوو دەنووسێ. ئەویش نەخۆشییەکی خراپە لە بەرانبەر شکڵانییەتدا.

- چیخۆف، رای وایە، یان بەگشتی رەخنەگرانیش هەر رایان وایە هونەری کورتە چیرۆك، هونەری چڕکردنەوەیە، چڕکردنەوەی بیر و بۆچوون و تێڕوانین، بەڵام بەداخەوە چیرۆکنووسی لای ئێمە بە زۆری لە پەیامی کورتە چیرۆك حاڵی نەبووە، هەندێ چیرۆکنووس هەن، درێژدادڕی دەکەن، خۆیان بە شتی لاوەکییەوە خەریك دەکەن، تۆ چۆنی تێدەگەی؟

- بەڵێ، راستە، چیرۆکی کورت چڕکردنەوەیە، جگە لە چڕکردنەوەی زمان، چڕکردنەوەی وێنەشە، هەروەها ئەگەر بشێ و بڵێم، چڕکردنەوەی پاڵەوانیشە. چیرۆکی کورت ١-٥ کەس هەڵناگرێ. هەندێك هەیە ئەو درێژدادڕییەیان هەیە، زۆربڵێیان هەیە. شتێك، یان حاڵەتێکی دەروونیی دەرەوە دەتوانن بە دوو سێ رستە چڕ بکەنەوە، کەچی بە ٢-٣ لاپەڕە ئەو شتە ناگەیەنن بە خوێنەر: ئەوە لای چیرۆکنووسانمان زۆرە.

- هەر ئەم درێژدادڕی و خاوکردنەوەیە، خوێنەر تووشی تەرەهولی فیکری دەکات.

- نووسەرانیش تووشی تەرەهولی فیکری هاتوون، دەنا بۆ وا دەکەن و لەسەریشی سوورن، کە پێشیاندەگوترێ: کورتە چیرۆك وانییە، لە کەلی شەیتان دانابەزن.

- ئینجا دێینە سەر لایەنێکی تری گرنگ لە کورتە چیرۆك، کە ئەویش ئسلوبە (شێواز). دەتوانم بڵێم چیرۆکی کورت (هونەری ئسلوبە) بۆ ئەوەی چیرۆکنووسێ لە چیرۆکنووسێ جیابکرێتەوە، بایەخ بە ئسلوب دەدرێ، بۆ نموونە گەورە چیرۆکنووسانی دنیان هەر لە چیخۆفەوە تا ئەدگار ئالان پۆ و تا مۆپاسان و تا درەوشاوەکانی ئەم بوارە، هەر یەکێك ئسلوبێکی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە. دەڵێن ئەمە ئسلوبی چیخۆفە لە چیرۆك، ئەمە شێوازێکی مۆپاسانییە، ئەمە رێچکە و شێوازی (ئادگار ئالان پۆ)یە، وای لێ هاتووە ئەو نووسەرانە بە ئسلوبەکانیان دەناسرێنەوە، تەنانەت هەریەکەیان تەوژمێکی هەیە پێی دەناسرێتەوە، کەچی لەلای ئێمەدا، خەمی دۆزینەوەی شێواز کەم بەدی دەکرێت، تۆ رات چییە؟

- شێوازاندنی زمان لە چەند شوێنێکدایە، زمان و لە پاشان دارشتنی وێنەو دوایی روئیا، راستە پێویستە، هەر چیرۆکنووسێ زمانی تایبەتی خۆی هەبێ، بەڵام هەموو کەسێ ناگاتە ئەو ئاستە، زۆر کەمن ئەو کەسانەی، کە بەبێ ناوەکانیان بتوانی بەرهەمەکانیان بخوێنیتەوە. من، تارادەیەك دەڵێم کەسانێ پێدەزانم لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی زمانی شێواز و مۆنتاژ و ئەمانە، جۆرە شتێکی تایبەتن بەمن، زمانی تایبەتی من و تەکنیکەکانم تایبەتن و زمانم لەلای خوێنەران دەناسرێ. کەسانی تریش هەن زمانیان دەناسرێن..

- بێینە سەر مەسەلەیەکی زۆر گرنگ لە ئەدەبدا بەکارهێنانی فەنتازیا و سوود وەرگرتنە لە کەلەپوور و داب و نەریتی میللەتی خۆت، کە ئەدەبی دنیای ئەمڕۆی پێ دەناسرێتەوە، تەنانەت لە شیعریشدا بە نموونە دەبینیت (لۆرکا) بۆیە بووە بەو شاعیرە، چونکە سوودی لە کەلەپوور و گۆرانیی قەرەجان وەرگرتووە، کە لە ئیسپانیا هەیە. ئەمەریکای لاتین هەر هەموویان سوودیان لە فانتازیا و ئەفسانە و کەلەپووری خۆیان وەرگرتووە بۆ دروستکردنی رێبازێك، کە بەناوی ریالیزمی ئەفسوونگەری ناوی

ڕۆیشتووە، بەڵام لەلای ئێمە زۆر کرچ و کاڵانە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەلەپوور دەکەین، کە هەڵسوکەوتێکی زۆر هەڵبژرکاو و بەرتەنگە و زۆر بەدەگمەن توانیومانە سەرکەوتووانە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەلەپوور بکەین، تۆ هۆی ئەمە بۆچی دەگێڕیتەوە؟

- ئەگەر بکرێ، بناغەی چیرۆکی کوردی دامەزرێنین، دەبێ لەسەر داب و نەریت و داستان و ئەفسانە و کولتوور دابمەزرێ و بە بۆچوونێکی سەردەمایەتی دایمەزرێنین. کەلەپوورێکی زۆر کۆنی نووسراو و نەنووسراومان هەیە لە سنگی پیران و.. لە دێهاتەکان هەیە. ئەتنۆگرافیای زۆرمان هەیە، بۆ نموونە میتالۆژیای ئێزدییەکان و کاکەییەکان ئەگەر بە قووڵی ئاگاداری بین، سەیر دەکەین ئەمانە کەلەپووری نەتەوایەتیی کوردن، زۆر تیرەی تریشمان هەیە، تەنانەت زەردەشتییەکان، کە لە ئێران ماون، ئەوان رەسەنایەتیی کوردن، ئەگەر بتوانین لێیان نزیك ببینەوەو دووبارە ئەو کەلەپوورەی، کە ماونەتەوە، یان لە سنگی پیراندا هەیە بیانخوێنینەوە. وابزانم خۆمان دەدۆزینەوە. من ئەم رێگەیە نەك هەر ئێستا، بیست ساڵە گرتوومەتە بەرو میسالیشم زۆرە (ئەو پیاوەی زوو سەری سپی بوو) لەوێوە دەستم پێکردووە، دەیان چیرۆکم هەیە، هەموویم لە کەلەپوورەوە وەرگرتووە، بەتایبەتی رۆمانی دواییم (سۆناتای رۆح) ئەفساندوومەو بەپێی روئیای خۆم دامڕشتوون، کە خۆم بڕوام پێیان بووە، نەك روئیای کۆن.

- ئێستا ئەوەی سەرنج دەدرێ لە کورتە چیرۆك و لە شیعر و هەموو بوارەکانی تری داهێنان، هونەرێ نەماوە دابڕاو بێ لە هونەرەکانی تر، هەمووی دەست لەملانێی یەکترن و تێکەڵن و سوود لە یەکتر وەردەگرن.. کورتە چیرۆك زۆر سوودی لە هونەری سینەما و مۆسیقا و هونەری شانۆ وەرگرتووە، چیرۆکنووسی کورد زۆر لالووتە لە هونەرەکانی تر، چیرۆکنووسی کورد زۆر بایەخ بە هونەری شێوەکاری نادات، بەلایەوە گرنگ نییە گوێ لە مۆسیقا بگرێ، یان بەلایەوە گرنگ نییە سوود لە ئینجازاتی سینەما وەربگرێ، تاك تاکی لێ دەرکەی کە بایەخ بەو لایەنانە دەدەن، ئێوە بۆ ئەم سڕینەوەو نەمانی دیوارانە لە نێوان هونەرەکان راتان چییە؟

- هەروەکو چۆن بنیادەمێك چەندین زمان بزانێ ئەوەندە کەسایەتیی هەیە، لە ئەدەبیشدا چەند چیرۆکنووس شارەزا بێ لە شیعر و شێوەکاری و سینەماو تەنانەت زانستەکانی دەروون و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی، ئەوە دەتوانێ هونەرییانە ئەوە تەوزیف بکات، وەك وتم دەتوانێ لە شوێنێکدا بیکەی بە زمانی رەنگ، یان بە دیمەنی سینەمایی، نەك بە تەنیا بۆ خۆشاردنەوەو لە سانسۆر و ئەمانە لە تاو قەدەغەی تابلۆکان (ئایین+سێکس+رامیاری)، بەڵکو وەك جوانسازییەك (ئێستێتیکا) وەك زانستێك و شێوە رێبازێك. ئەمڕۆ ئەدەبی کوردی، مەبەستم لە رۆمان و چیرۆکە، بەرەو جیهانی پەل دەهاون و لە پەنای خۆماڵێتی و ئەو چەمکانەوە لە سەرەوە باسمان کردن، بۆیە دەبێ کەڵك لە هەموو ئەوانە وەربگیرێ، ئەگەر رۆماننووس مەوسووعی نەبوو، ئەوە لە ئاستی هونەرەکە و نووسەرەکە و نووسینەکەش کەم دەکاتەوە. لەگەڵتام سەد دەر سەد.

- تا ئێستا ئێمە تاڕادەیەك باسی ناوەڕۆکی چیرۆکمان کرد، دێینە سەر رۆمان، تۆ دوو رۆمانت لە بازاڕدایە و هەندێ نۆڤلێتیشت نووسیوە، رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە) هەرچەندە شتی زۆری لەسەر نووسرا، بەڵام هەن بە رۆمانی نازانن وەك برای چیرۆکنووس (حەمە کەریم عارف) دەڵێ: قوتووی عەتارە، تۆ وەڵامت بۆ ئەو رەخنەیە چییە؟

- وەك برای نووسەر مەحموود زامدار لە (میربەد)ێ لە میربەدەکان وابزانم ١٩٨٠ بوو وتی: (تۆ مورەشەحی رۆمان بنووسی، چونکە لە شارێکی شارستانی دایت و چیرۆکەکانت پێشکەوتوون.) وتم: (مژدەت بدەمێ دەستم پێکردووە.) بەڵێ، من.. (هەڵکشان بەرەو لووتکە)م لە ١٩٧٩-١٩٨٤دا نووسی و لە کۆتایی رۆمانەکەدا نووسراوە، کە لە ١٩٨٤دا پێشکێشم بە دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا کردووە، بەڵام بەداخەوە شەش ساڵێك دوایانخستووە. لە (هەڵکشان بەرەو لووتکە)دا وەك کەسانی تر پەشیمان نیم لەوەی، کە نووسیومە. هەر (١٠) ساڵێك جارێك بێم، راست و چەپێ لە خۆم بدەم و بڵێم: ئەمە سەرەتامە. دەتوانم دوای (١٠)

ساڵی تریش خەریکی ئەم گەمەیە بم.. برای زرۆ بەڕێزم.. حەمە کەریم عارف کە ئەم قسەیەی کردووە وا هەست دەکەم وەك گلەیی لە دڵدا بێ، یان گرێیەکی دەروونی بەرانبەر من هەبێت وایە. (رامان) نەپرسیارێکی لەبارەی عەبدوڵڵا سەڕاجەوە لێ کردووە، نە پرسیارێکی لەبارەی هەڵکشان بەرەو لووتکەوە لێ کردووە، یەکسەر وتوویەتی: (عەبدوڵڵا سەڕاج، رۆمانەکەی قوتووی عەتارە). ئەز، دووبارەی دەکەمەوە: راستە رۆمان قوتووی عەتارە و وەك پێشتر گوتم رۆماننووس کەسێکی مەوسووعییە، بەڵام گومانم هەیە لەوەی کاك حەمە کەریم عارف رۆمانەکەی باش خوێندبێتەوە. ئەگەر خوێندبێتیشیەوە سەرپێیی خوێندیویەتییەوە، چونکە چەندێ تەکنیك لە هونەری رۆماندا دەزانم، لەوێ هەموویم بەکارهێناوە. لە دانیشتنێکدا هەمووی بۆ بخەمەڕوو، با لەمنەوە فێربێ رۆمان بنووسێ. هەرگیز پەشیمان نیم لە (هەڵکشان بەرەو لووتکە)، بەڵام لە (کاولاش) و (سۆناتای رۆح)دا -ئەمانە هەموو رۆمانن- لە (رەونامە-کۆڕەو)دا خۆم تێکەڵ کردووە، ئەمەیش بەشێکە لە سۆناتای ژیان.

- پێتوایە هەرکەسێ کورتە چیرۆکی نووسی دەبێ بە زەروورەت رۆمان بنووسێ؟

- نەخێر، هەیە لە هەموو ژیانیدا چیرۆکی کورت دەنووسێ، تا دەشمرێ رۆمان نانووسێ. هەیە بە پێچەوانەوەش دیاردەیەکمان هەیە، برادەرێکمان (حسام بەرزنجی) بە رۆمان دەستی پێکردووە. برای ئازیزم، چیرۆکنووسی شارەکەم (باوەگوڕ و و ناوی بە ئاراپخا دەبەم) (جەلیلی قەیسی) ئەز جارێك لەگەڵیدا دانیشتم و وتم: بۆچی رۆمان نانووسی؟ وتی: ناتوانم رۆمان بنووسم، وتی: هەوڵم داوەو سەرکەوتوو نەبووم.

- بە نیسبەت وەزعی رۆمان-دەبێ (رۆمان) بخەمە کەوانەوە وەك زاراوە- ئەو رۆمانانەی کە هەن لە ئەدەبی کوردیدا، تۆ لە کامیان رازیت، کە بەمانای وشە ناوی بنێی رۆمانن؟

- ببوورە، رایەکەی کاك حەمە کەریم عارف، دەترسم هەندێ لەم رایەی ناو (رامان)یش پەشیمان ببنەوە، زۆر هەن پەشیمان دەبنەوە. پێش ئەویش (محەمەد فەریق حەسەن) و (غەفوور ساڵح عەبدوڵڵا) لەبرێ چیرۆکیان پەشیمان بوونەوە. ئەدەبەکەمان

پەشیمانی و پەشیمان بوونەوەیە. با بێمە سەر وەڵامی پرسیارەکەت، ئەگەر بێتو (کوێخا سێویٚ) و (شار) باس بکەم، هەریەکەیان لەلایەنێکیان داوەو چەند لایەنێکیان فەرامۆش کردووە. (هەڵکشان بەرەو لووتکە) هەرچەندە بەرهەمی خۆمە، بەڵام پێشکەوتوو نییە. من، لەم چەند مانگەدا، رۆمانێکی (هیوا قادر)م بەناوی (ئاوێنە سەرابییەکان) بۆ هات لەلایەن خودی نووسەرەکەیەوە، کە رای خۆمی بۆ بنووسم. بیروڕای خۆم لە چەند فولسکابێکدا بۆ نارده (سوێد) بەڕاستی رۆمانێکی باشی نووسیوە، سەرەڕای ئەوەی هەندێ هەڵەی زمانەوانی و مۆنتاژی تێدایە، بەڵام بە رۆمانێکی باشی دەزانم، کە گەنجێکە ئەوەی نووسیوەو چیرۆکنووسانم هان دا بیخوێننەوەو هەموویان رای منیان لەلا گەڵاڵە بوو.

- لە رۆمانی دووەمتدا (کاولاش) چەند توانیوتە تەجاوزی کەم و کورتییەکانی رۆمانی یەکەمت بکەی؟

- ئەز، ئەو رۆمانە بە قۆناغێ دەزانم، کە گرنگیم بە کەلەپوور و پەندی پێشینیان و شتە ئەتنییەکانی شاری کەرکووك داوە، وەك پێشتریش پاساوم بۆ داوە، وتم: ئەو شارە لەناودەچێ، دەبێ تۆماری بکەم و لەوەش پەشیمان نیم، چونکە بۆ پاشەڕۆژە. دەتوانم بڵێم: (کاولاش) ئەزموونی (١٠) ساڵە لە (١٩٨٦)دا لە کەرکووك تا لە (١٩٩٦)دا لە هەولێر تەواوم کرد. هەتا ئێستا، ئەمە چوارەمین دەقێتی Text بە دەستکارییەوە دەینووسمەوە. ئەمە رۆمانێکی فرە دەنگە، گشت کەسەکان بە ئازادی قسە دەکەن، تەنانەت من زۆرجار رام لەسەریان نییە و خۆیان قسان دەکەن، بەڵام تەکامول لە هونەردا نییە، چونکە ئەگەر بڵێم (تەکامول) واتا وەستام، هەرچەندە زۆر لێی رازیم. لەویش راستتر، ئێستا (سۆناتای رۆح) کە (٦٣) لاپەڕەیە و نامیلکەیەکە، لەمیش یەکجار رازیم، چونکە گوزارشت لە بیر و بۆچوون و فەلسەفە و هونەرکاریم دەکات، هەرچەندە ئەمەی دواییم، بە ماوەیەکی کورت نووسیوە.

- تۆ هەندێ نووسینت لەبارەی شێوەکاری نووسیوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات، کە تۆ بایەخ بە هونەری شێوەکاری دەدەی، وەك چیرۆکنووسێ چەند سوودت لە هونەری شێوەکاری وەرگرتووە؟

- لە ساڵی (١٩٧٣-١٩٧٤)دا لە هەفتەنامەی (هاوکاری)دا بە زنجیرە (٣١) وتارم لەسەر شێوەکاری و هونەر بڵاوکردەوە، ئیتر لەبەر چەند هۆیەك وازم لێ هێنا. بەڵێ، من شێوەکاریم خواستووەو پێشتریش نیگارکێش بووم، تەنانەت لە قۆناغی ژیانی دواناوەندیمدا، لەگەڵ مامۆستاکەمدا (مەحموود ئەلعوبەیدی) و لەگەڵ (دکتۆر سینان سەعید) کە پێکەوە ئەوسا قوتابی بووین (سینان) پلەی یەکەمی هێنا، من پلەی دووەمم هێناو مامۆستاکەمان پلەی سێیەمی بەرکەوت. مەدالیایەکی زیوینم پێدرا، بەڵام وازم لە نیگارکێشان هێنا، چونکە ئەدەبم بەلاوە گرنگتر بوو، هەروەها وازم لە شیعراندنیش هێنا، چونکە چیرۆك هەموو غەمێکی منە.

- ئەوەی بەرهەمەکانی تۆی خوێندبێتەوە، دەبینێ ئافرەت لە زۆر لەو چیرۆك و ئیشانەت، ئامادەبوونی هەیە، چۆن دەڕوانیتە ئافرەت؟ لەو بەرهەمانەتدا بە چ مەبەستێ ئەو بایەخ و رووپێوەی بۆ تەرخان دەکەی؟

- ئافرەتم دەستنیشان نەکردووەو بڵێم پیاو و ئافرەت، من بە ئینسانێکم زانیوەو لە ماڵی منیشدا ئاوهایە. لە چیرۆکەکانمدا دەستنیشانم نەکردووە، بەتایبەتی شتێکم بۆ ئافرەت نووسیبێ، بەڵام ئەو کەسانەی ئافرەتن لە چیرۆکەکانمدا وەك پیاو قسان دەکەن و بیروڕای خۆیان بەشێوەی نوێ و زانستییانە و بە ساکاری دەردەبڕن و منیش لەگەڵیاندام. پێش ئەوەی لەبارەی ئافرەت بنووسم، ئەگەر نەتوانم ماڵ و حاڵ و خێزانی خۆم جێبەجێ بکەم، ناتوانم بینووسم. کچی خۆم و خێزانی خۆم ئازادیی متڵەقم پێداون، تەنانەت هەڵبژاردنی هاوسەریشیان، بە ئارەزووی خۆیان بووە.

- جگە لە هەوڵی رۆمان، من هەندێ شانۆیی جەنابتم بینیوە، ئایا هەر لێرە وەستایت، یان بەرهەمی ترت هەیە؟ ئەو هەوڵە شانۆییانە چی رایگرت؟

- سەرەتای شانۆنامە نووسینم، دەگەڕێتەوە سەرەتای ئەو گۆڕانەی لە نێوان شیعر و چیرۆکدا هەمبوو لە گۆڤاری (رزگاری)ی ژمارەکانی (١١-١٢-١٣) (کوورەی ئاسنگەر)م بڵاوکردەوە، ئەوە بووە هۆی ئەوەی، کە برایەکی روانگەیی پێوەندیم پێوە بکات، کە لەو کاتەدا چاوم تووشی (الانفصال الشبکی) ببوو، چووم بۆ نەمسا و پاشان قاهیرە و دکتۆر خوێندنەوەی لیّ قەدەغە کردم. ئەو هاتە لام و پێم گوت: باشە، بۆ منت هەڵبژارد؟ وتی: تۆ، یەکیّ لە کەسایەتییەکانت، لەو شانۆنامەیەدا، شیعرێك دەخوێنێتەوە، ئەو شیعرە بەوانە دەچێ، کە ئێمە دەمانەوێ. ئەوە، یەکەم شانۆنامەمە دوای ئەوە لە (١٩٧٣)دا شانۆنامەی (ئایا هەموومان شێتین) بڵاوکرایەوە، پاشان بۆم روون بووەوە، کە ئەوە مۆنۆدرامایە، پێشتر نەمدەزانی بەو جۆرە دەڵێن (مۆنۆدراما) ئەوەش یەکەمین مۆنۆدرامایە لە ئەدەبی کوردیدا. دووەمین مۆنۆدرامای ئەدەبی کوردیش بەناوی (قەفەس)ە، هەر من نووسیومە. سێیەم مۆنۆدرامای ئەدەبی کوردی (محێدین زەنگنە) نووسیویەتی، کە ئەویش بە کوردی نازانم، چونکە دەقەکەی بە عەرەبی نووسراوە، بێجگە لەوانە (پێداچوونەوە)م نووسیوە، کە پێداچوونەوەیە بە چیرۆکەکانمدا و موحاسەبەی خۆم دەکەم خەمی سەرەکیم هەنووکە بۆتە رۆمان و دەبیّ خۆم لە شانۆنامە نووسین دووربخەمەوە. لەم ماوەیەدا رۆمانێکی (گەراهام گرین)م بەناوی (ئەو پیاوەی لە مەرگ دەترسا) ئامادە کرد بۆ شانۆ. نەختیّ خەمی شانۆم لەلا ماوە، بەڵام کاتم بەدەستەوە نەماوەو تەمەنیش رووی لە لێژییە. لەم رۆژانەدا، لەمەڕ چیرۆکی (کڵاو) دەرهێنەرێك پەیوەندیی پێمەوە کردو گوتی: لای من زۆر پەسندەو حەزك دەکەم بیکەیتە مۆنۆدراما. گوتم: کاتم نییە.

- تۆ ماوەیەك نووسینت بە عەرەبی بڵاوکردۆتەوە، هۆی نووسینت بە عەرەبی، بۆ گرفتی زمان دەگەڕێتەوە، یان هۆی تر هەیە؟

- لە سەرەتادا وەك گوتم زمانەکەم پاراو نەبوو. لە سەرەتای پەنجاکان تا کۆتایی شەستەکان بە عەرەبی دەمنووسی و لە (خەبات) و (شەفەق)دا بڵاو دەکرانەوە، بەڵام ئەوە بووە قۆناغیّ. پاشان بڕیارم دا بە کوردی بنووسم. زۆرجار هەیە مادەیەك بە

عەرەبی باشتر دەتوانم باسی بکەم، چونکە زاراوەی تێدایە، یان زۆرجار بەرهەمی چیرۆکێکم بە باشی و جیهانی دەزانم دەیکەمە عارەبی. برادەران دێنە لام و دەڵێن: تۆ عەرەبییەکەت لە کوردییەکەت باشترە، بەڕاستی من، عەرەبییەکەم لە کوردییەکەم باشترە، چونکە لەوێوە باشتر دەتوانم ئەسپی خۆم تاوبدەم و ئینکاری ناکەم. زمانی کوردی کۆڵەوارە و کەمبڕە لە ئاست ئەو چەمکە فەلسەفییانەی، کە دەمانەوێ، یان ئەو شتانەی لە ناخمدایە بە عەرەبی جوانتر دەردەبڕێن، ئەڵبەتە قۆناغەکانی خوێندنم بە عەرەبی بووەو لەو سەردەمانەشدا کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی زۆر کەم بوون.

- بەڕای من، قسوور لە زمانەکەدا نییە، ڕەنگە مومارەسەت پێ نەکردبێ، کە خوێنەر کتێبی وەك (زاراوەسازیی پێوانەیی)، یان (مرۆڤ و دەوروبەر)ی مەسعوود محەمەد دەخوێنێتەوە، هەست دەکەی زمانی کوردی ئەگەر بتەوێ بە وردی بەدوایدا بگەڕێی دەرەقەتی نووسینی فەلسەفی دێت، بەڵام دیارە جەنابت نەتکردۆتە خولیایەك.

- راستە و مومکینە. ئەوانەم خوێندۆتەوە، بەڵام سەد دەر سەدیش لە هەقی چەمکە فەلسەفییەکان نەهاتووە، یان ماتماتیك و ئێستێتیکا، تا ئێستە ئێمە (ئەبستراك)مان بە نموونە نەکردۆتە کوردی. کاتی خۆی لە کۆڕی زانیاریی کوردیدا، یەکێك بووم لە داوەتکراوەکان بۆ داڕشتنی زمانی کوردی، وتم ئامادەم هاوکاریتان لەگەڵدا بکەم بۆ داڕشتنی لکی شێوەکاری زمانی بیانییەوە بیکەمە کوردی-لە عەرەبییەوە بۆ کوردی- ئێستا خەریکە زمانی کوردی پەرە دەستێنێ. زمان وەکو گیانلەبەرە، بەڵێ تەشەنە دەکات و دەشمرێ، زمانە کۆنەکان مردن، ئەوانەی بەرگەی ژیانیان گرت-وەك زمانی کوردی- دەمێننەوە، چونکە زمانێکی دینامیکییە.

- بەڵگەش بۆ ئەوە، کە زمانی کوردی قسووری نییە زمانی قورئانە کە زۆر فەخمە، مام هەژار توانیویەتی قورئان بکاتە کوردی، واتە زمانی کوردی دەتوانێ ئیستیعابی ئەو کایە مەعریفییانە بکات و زۆر شتی پێ دەربڕێ. دەمێنێتەوە سەر نووسەرەکە خۆی.

- کارێکی پیرۆزە، کە مام هەژار ئەوەی کردووە، بەڵام خودی خۆم ئەو پاچڤە کوردییەم نەدیوە، بەباشی دەزانم، بەڵام هەژار لای من ناسراوە، کە زمانی پاراوە، بەتایبەتی فەرهەنگەکەی گەواهی دەدا، بەڵام هێشتاکە من دەڵێم ئەوەندەی لە زمانی عەرەبیدا شتی ئایینی و فەلسەفی هەیە، دەبێ ئێمەش زۆر خۆمان ماندوو بکەین تا لە بەرانبەری بوەستین.

- (نالی) هەر بۆ (تەحەددا) کاتی خۆی شیعری کوردیی نووسی، لە کاتێکدا (تەمجید)ی زمانی فارسی و عەرەبی دەکرا، ئەوە دەڵێ: (کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کردییە خۆ کوردییە

هەر کەسی نادان نەبێ، خۆی تالبی مەعنا دەکا).

(یەعنی) یەکێ زۆر (عاقڵ) نەبێ لە زمانی من تێناگا. زمانی کوردی پێموایە (قاصر) نییە و زمانی داهێنان و فەلسەفەیە، بەڵام بە راستی، ئێمە خزمەتی زمانی خۆمان نەکردووە.

- ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی قەوارەی سیاسیمان نییە، کۆڕی زانیاریمان نییە. تێکۆشانەکان خودی و کەسییە، ئەوەی ئاماژەت پێدا -زمانی نالی- پاش سەدو پەنجا ساڵ، ئەمڕۆ هەن بە زمانی نالی نانووسن، سەیرە. مەگەر (پیرەمێرد) بتوانێ لەو ئاستە بنووسێ، زمانێکی زۆر پاراوی هەیە. من موعجیبم بە (نالی).

- تۆ ماوەیەك بایەخت بە هونەری شێوەکاری دەدا، تا چ رادەیەك سوودت لەو هونەرە وەرگرتووە؟

- ئەوەی چیرۆکەکانم دەخوێنێتەوە هەست دەکات هەستێکی جوانی تێدایە، بەتایبەت لە گۆشەنیگای دیمەن و شێوەکان، لە هەڵبژاردن و تێکەڵاوکردنی رەنگەکان، لە داڕشتنی هێڵەکان، تەنانەت ئەگەر بزانم زمانی نووسینم کورت دێنێ، ئاماژە بۆ تابلۆکان دەکەم: ئەلجریکۆ و گۆیا و شاگاڵ و هەموو تازەکان. بەڵێ، زۆر کەڵکم لە هونەری شێوەکاری وەرگرتووە بەتایبەتی لە داڕشتنی جوانی وێنەدا.

- لای رۆماننووسێکی وەك (هیرمان هیسه) لە رۆمانێکدا وەك (لعبه الکریات الزجاجیه) و کۆچیرۆکی (أحلام النای) زۆر سوودی لە مۆسیقا وەرگرتووە. لای رۆماننووسێکی وەك کۆنستانتتان جۆرجیۆ (الساعه الخامسه و العشرون) تەوزیفی هونەری (پیکاسۆ) دەکات، کە دەڵێ: من لە تابلۆی پیکاسۆ تێنەگەیشتم، کە سەرو دەست و قاچ هەموو چووبوون بەناویەکدا تا ئەو چرکەساتەی، پاڵەوانی رۆمانەکە (ئیوهان مۆریتس) دەخەنە ناو زیلێکی سەربازییەوە، کە دەڵێ لە پشت ئەو زیلە (٧٠) کەس زیاتر بووین بەسەریەکدا سیخناخ کرابووین، کە ئێمەیان ئاخنیبووە ناو پشتی ئەو ئۆتۆمبێلەوە، ئەو کاتە کە قاچ و دەستمان تێکەڵ بوون. ئینجا من لە تابلۆی پیکاسۆ تێگەیشتم، کە بۆچی دەست و قاچ و سەرەکان تێکەڵ یەك بوون، چیرۆکنووس و رۆماننووسی کورد کەمتر دەتوانێ تابلۆی بەناوبانگ و مۆسیقا تەوزیف بکات لەناو بەرهەمەکەیدا، ئایا هۆیەکەی چییە؟

- وەك ئاماژەت پێدا، مۆسیقا لای (هیرمان هیسه) و شێوەکاری لە رۆمانی (سەعاتی بیست و پێنجەم) و ئیزافەکردنی شێوەکاری بە رۆمان (کلۆد سیمۆن) خەڵاتی (نۆبڵی) وەرگرت. من ئەوە دەگەڕێنمەوە بۆ ئەوەی هێشتا رۆمانی کوردی ساوایە، بەو گەورەیییەی لە رۆژئاوا کراوە، لێرە نەکراوە، هەتا ئێستا تێکەڵ بە ژیانی رۆژانەمان نەبووە. ئێمە حەیران و گۆرانی و لاوك و قەتار و ئەڵلاوەیسیمان هەیە، کە بچووکن بەرانبەر بە سیمفۆنیایەکی گەورە، ئەز زیاتر لە چیرۆکدا ئەو هەوڵەم داوە، بەڵام رۆمانی کوردیمان چەندساڵێکی دەوێ تا دەیان رۆمان بنووسرێ، ئینجا ئەو شتانە شارستانیتر وەردەگیرێن و تەوزیف دەکرێن لەناو بەرهەمەکانماندا.

- جەنابت دەڵێی مۆسیقا نەبۆتە شتێکی پێویست لە ژیانماندا، واتە ژیانی کۆمەڵگە، بەڵام دەبێ لای ئینسانی چیرۆکنووس، کە مومارەسەی ئیبداعی خۆی دەکات، رۆشنبیریی مۆسیقای هەبێ و بیکاتە پێویستی و کاتی خۆی بۆ تەرخان بکات و سوودیشی لێ ببینێ..

- بەڵێ.. من بەگشتی باسم کرد. خۆم دەمێکە گوێ لە سیمفۆنیاکانی جیهان دەگرم، بەتایبەتی مەراقم گوێگرتنە لە سیمفۆنیاکانی بتهۆڤن و سوودیشم لێ وەرگرتوون و بەکاریشم هێناوە..

- بەشێوەیەکی گشتی قسە دەکەم، چیرۆکنووسی کوردو شاعیری کورد دەبێ لەو سەردەمەدا رۆشنبیرییەکی فراوان و مەوسووعییان هەبێ.

- بەڵێ، خۆراکی رۆحە مۆسیقا، هیچ نەبێ هاندان و ئیستراحەتە بۆ مێشك.

- تەوەرێکی تر، کە لایەنی رەخنەیە. لەناو ئەدەبی کوردیدا، وەك هەموو بەشەکانی تر، کەموکوڕیی خۆی هەیە. جەنابت چەند رازیی لە رەخنەی کوردی؟ ئایا توانراوە لایەك لە تۆ بکرێتەوەو بەشێك لە حەقی خۆت وەربگری؟

- بەڵێ، رەخنە وەك ژانرێکی ئەدەبی دەبێ هەبێ، بەتایبەتی ئەوەی من لەم چارەکە سەدەیەدا خوێندوومنەتەوە، هەندێ بوون بەسەر بەعزە بەرهەمێکدا هەڵیانداوە، یان شکاندوویانەتەوە. هۆی زۆرە، هەڵمگرەو هەڵتدەگرم و لەسەرم بنووسە و لەسەرت دەنووسم و ئەوانە هیچ کاتێ بە رەخنەی نوێ نازانم. رەخنەی نوێ ئەوەیە لە دەقەکە بکۆڵێتەوەو هەڵکۆڵبینی خۆی تێدا بکات، گوێ نەداتە کەسایەتیی خودی نووسەر. جوان کون و کەلەبەری دەقەکە بپشکنێ. ئەمڕۆ، خەریکە چەند دەقێکی باش دەرگا بۆ رەخنەی باش دەکەنەوەو رەخنە پێدەگات بۆ ئەوەش، کە ئایا رەخنەی کوردی لای لە من کردۆتەوە؟ دەڵێم: نەخێر باش لای لێ نەکردوومەتەوە، بەڵام خەریکە بمدۆزێتەوە، نارازیبوونی من لە رەخنە، شتێکی جیهانییە، هەمیشە نێوان نووسەر و رەخنەگر ناتەبایی هەیە. حەز دەکەم گوێ لە رەخنەگرێ بگرم لە زانستەکەی خۆی شارەزابێت.

- مەسەلەی گۆشە نووسین، هونەرێکی سەربەخۆیە و هەموو کەس ناتوانێ گۆشە بنووسێ. جەنابت گۆشەی سەربەخۆت هەبووەو لە کوردستانیش ئێستا کۆمەڵێ گۆشە هەن، تۆ چۆن لە گۆشە نووسین تێدەگەیت و پێتوایە گۆشەی سەرکەوتوو چۆنە؟ چ گۆشەیەکت بە دڵە؟

- چەند ساڵێك لەمەوبەر تەحەددای چەند رۆماننووسێکم کرد، کە خۆیان کردووە بە رۆژنامەنووس و هیچیان لەبەردا نییە، تەنیا بۆ خۆسەلماندنە و هیچی تر. من لەبەردەم (٤٠-٥٠) کەسدا وتم: ئامادەم گۆشە نیگایەك بنووسم بۆ حەفتەنامەی (رێگای کوردستان) بەخۆڕایی. ئێستا گۆشەکەم گەیشتۆتە (٤٦) و تا خوێنەرانم بێبەش نەکەم، تەنانەت ئەم بەیانییە یەکێك لە سەرجادە رایگرتم و گوتی: خۆشحاڵم بەو گۆشەیەی کە هەتە، هیوام وایە وابنووسی و وا بنووسی، بەڵێ، داوام لێ دەکەن شتی سیاسی بنووسم، تەنانەت لە خودی رۆژنامەکە حەزدەکەن، من شتی میللی بنووسم. من پێیانم وتووە: شتی رۆشنبیری دەنووسم. خیتابەکەم ئاراستەی رووناکبیرانە، زۆریش لە رۆشنبیران پێیان پەسندە، لەوانە (رەئووف حەسەن و عەتا قەرەداغی) یەکێ لەوانە (رەئووف حەسەن) وتی: چاوەڕێ نەبووم، تۆ بیگەیەنی بە (٤٦) وامزانی پەکت دەکەوێ. من گوتم: تا ماوم هەر دەنووسم و هەر شتیشم پێ ماوەو هەر جارەی شتێکی نوێ دەڵێم. وابزانم گۆشەکەم سەرکەوتووە بۆیە ئەگەر بۆم کرا، هەر بەردەوام دەبم.

- لەبارەی خیتابی رۆشنبیریی کوردی، پێتوایە لە تەبەعیەت خۆی رزگار کردبێ و توانیبێتی کەسایەتییەك بۆ خۆی دامەزرێنێ؟ ئەگەر نەیکردووە بۆ لەمەولا چی بکا باشە، بۆ ئەوەی خیتابێکی رۆشنبیریی کوردی بۆ خۆی دامەزرێنێ؟

- راستییەکەی تا ئێستە نەیتوانیوە خۆی راتەکێنێ و گوتارێکی رۆشنبیریی تایبەت بەخۆی هەبێ، بۆ؟ لەبەر تەئسیراتی زمانەکانی فارسی و تورکی و عەرەبیی دەوروبەرمان. ئەمە ماوەیەکی ئیستقراری دەوێ تا بتوانین گوتاری تایبەت بە خۆمان دابمەزرێنین، بەڵام وەك پێشتر گوتم، گەڕانەوە بۆ داب و نەریت و کولتوور و داستانە رەسەنەکانمان و تەوزیفکردنیان، ئا لەوێوە گوتارێکی رۆشنبیریی تایبەت بە خۆمان دادەمەزرێنین و خۆمان بە جیهانی بکەین و تاڕادەیەك هەوڵ بۆ ئەمە دراوە.

- تۆ ئێستە کۆمەڵێ بەرهەمت لە بازاڕە و کۆمەڵێکیشت لە ژێر چاپە و خەڵك ناوی زۆر لە بەرهەمەکانت دەزانن جگە لەوانە، چی ترت هەیە، کە بەرهەمی داهاتووت بێ و بکەوێتە بازاڕەوە؟

- ئەوەی لەژێر چاپدایە، رۆمانێکی دوورو درێژی گەورەیە وەك وتم، مەوسووعەی ژیانمە، بەناوی (کاولاش) مومکینە مانگێکی تر بێتە بازاڕەوە. ئەوەی چاوەڕوانی چاپ، رۆمانێکمە بەناوی (کۆچرەو-کۆچرەو) دەتوانم بڵێم بەڵگەنامەییە و باسی ئەزموونی خێزانیی خۆم و خەڵك و رەوکەران دەکەم.. بەداخەوە تا ئێستا چاپ نەکراوە... هەروەها کۆمەڵێ چیرۆك و گوتاری دیم هەیە، چاپ نەکراون.

- مامۆستا، هەندێ ناوت پێدەڵێم، بە چڕوپڕی رات لەبارەیانەوە بڵێ؟

- لەتیف حامید؟

- چیرۆکنووسێکی داهێنەری ساڵی حەفتاکان بوو، نوێخوازی چیرۆکی کوردی لەوەوە دەست پێدەکات، بەداخەوە وەك چرۆیەك زوو هەڵوەری.

- حوسێن عارف؟

- چیرۆکنووسێکی چاکە و ئێستا لەنێوان سیاسەت و هونەری چیرۆکدا داماوە.

- شێرزاد حەسەن؟

- چیرۆکنووسێکی باشە، بەڵام درێژدادڕی بە چیرۆکەکانی دەدات و وابزانم چڕی بکاتەوە باشترە.

- ئیبراهیم ئەحمەد؟

-رۆماننووسێکە، وەختی خۆی رۆمانی نووسیوەو دەتوانین بڵێین سروودێکە لە رۆمان و چیرۆکی کوردی لە قۆناخی خۆیدا رێزی خۆی هەیە.

- محەمەد مەولوود مەم؟

- چیرۆکنووسێکی بلیمەت بوو، توانی بە گوێرەی قۆناغەکەی زۆر شت بکات، بەڵام لە تەکنیکدا ئاسایی بوو.

- شاکر فەتاح؟

- وەك چیرۆكنووسێكی نەتەوایەتی تێدەگەم.

- **محەرەم محەمەد ئەمین؟**

- چیرۆكنووسێكی سالآنی پەنجاو شەستەكانە، بەتایبەتی چیرۆكی (شای قەرەجان)ی زۆر سەرنجی راكێشاوم، بەگوێرەی قۆناغی خۆی، زۆر شتی وتووە، بەلآم لە تەكنیكدا ئاساییە.

- شێخ مارف بەرزنجی؟

- یەكێكە لە چیرۆكنووسە باشەكانی شەستەكان، كە رەخنە لای لێ نەكردۆتەوە، دەستپێشخەریشە لە نوێكردنەوە.

- حەمە كەریم عارف؟

- چیرۆكنووسێكی ئاساییە، هەبێت، یان نەبێت شوێنێكی دیاری كراوی لە ڕووبەری داهێناندا نییە، گومانیش لەبارەی كارە وەرگێڕەكانی هەیە.

- **محەمەد موكری؟**

- بە رۆماننووسی دەزانم پتر لەوەی چیرۆكنووس بێ، ئسلوبی ئاساییە و حەزی لە فانتازیایە و كەڵكی لە زمانەكانی فارسی و ئەفغانی وەرگرتووە.

- عەزیزی مەلای رەش؟

- ئەگەر بشێ دەڵێم فۆلكلۆریستە، كەڵكی لە داب و نەریتەكان وەرگرتووە، ئەم بەشەشمان پێویستە و باشە هەبێ. بەلآم هیچ تەكنیكی نوێی رۆمانی لەلا نییە.

**عەبدوڵڵا سەڕاج:**

# ڕۆماننووسەکانی وەچەی خۆم، هیچیانم بە دڵ نین




**دیمانە: بۆتان جەلال**

**ڕۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٣٠٣٧**

کاتێك لە رۆژانی ١٩٩٧/٦/١٦ – ١٩٩٧/٦/١٨دا کۆنفرانسێکی جیهانی لە موکولا "Mukkula"ی شاری لاهتی Lahti لە فنلاندا بۆ کۆمەڵێك نووسەر و ئەدیبی وڵاتانی دونیا ساز کرابوو، لەنێو نووسەرانی کوردیش هەردوو رۆماننووس (عەبدوڵڵا سەراج) و (شێرزاد حەسەن) تێیدا بەشدار ببوون، پێش تەواوبوونی رۆژانی کۆنفرانسەکە مامۆستا عەبدوڵڵا داوەتنامەیەکی پێدەگات بۆ ئەوەی لەوێدا بەشداری بکات و پاشان بمێنێتەوەو نیشتەجێی ئەو وڵاتە ببێت. ئێستا دوای سێ ساڵ غوربەتی، لە سەردانێکیدا بۆ هەولێر. لە دیمانەیەکدا، کە ئەم پرسیار و وەڵامانەی لێکەوتەوە. بەم جۆرە بۆ دوا لاپەڕەی رۆژنامەکەمان دوا:

- ئایە بۆ لە هەندەرانی؟

- هۆکارە کاریگەرییەکانی غوربەتبوونم زۆرن.

- یەکەم ئاشنایەتیتان لەگەڵ نووسەر و رۆشنبیرەکانی ئەوێ؟

- کە گەیشتمە فنلاندا، خەسرەو پیرباڵ میوانداریی کردم بە نووسەری ناسراو (کرمانج حەقی-مەجید حەقی)، کە سەرنووسەری گۆڤاری (دەنگی کورد)ە لەوێ، ناساندمی. دوای چەند وتووێژو دانیشتنێك داوای لێ کردم ببمە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەو گۆڤارە. منیش قبووڵم کردو بازنەی ئاشنایەتیم بە برادەرانی دیکەی نووسەرانی ئەوێ فراوانتر بوو.

- لەو ماوەیەی لە فنلاندا بوویت، چیتان ئەنجامداوە؟

- جگە لە چەند دیمانەیەکی رۆژنامەوانی لە گۆڤارە ناودارەکانی ئەو وڵاتە و دیمانەیەك لەگەڵ رادیۆی (دەنگی ئەمەریکا) بە کوردی، کە کاك عومەر دزەیی ئەنجامی دا، لە زۆربەی بۆنە رۆشنبیری و ئەدەبییەکاندا بەشداریم کردووە، لەوانەش لە یادی (١٠٠) سەد ساڵەی حاجی قادری کۆیی، کە لە هۆڵی کایسا C.A.I.S.Aدا سازکرا، هەروەها لە ئاهەنگ و سیمینارە فیکری و سیاسییەکاندا، کە ئەو ماوەیەی

لەوێ سازکرابوون بەشداریم کردووەو تا پێمان کرابێ کێشە رەواکەی میللەتەکەمان و کولتووری کوردمان بە خەڵکی ئەوێ ناساندووە.

- بیستوومانە پێشانگایەکی شێوەکاریت لەوێدا کردۆتەوە؟

- بەڵێ، لە کامپی پەنابەران، لە شاری تامپری Tampere، کە لێی نیشتەجێم، پێشانگایەکی تایبەتی خۆم سازکرد، کە تێیدا (٦٠) تابلۆم پێشکێش کرد. خەڵکێکی زۆری بیانی سەردانی پێشانگاکەیان کردم و بووە مایەی بایەخ پێدانی نێوەندە هونەرییەکانی ئەوێ. جێگەی ئاماژەشە لەو شەست تابلۆیە (١٦)یان فرۆشران. هونەرمەندێکی شێوەکاری فنلاندی (٢) دوو تابلۆی کڕیم، کە لێم پرسی: تۆ خۆت هونەرمەندی شێوەکاری، تابلۆی منت بۆ چییە؟ وتی: تابلۆکانت، کە بە (٣٠) دۆلار دەیانفرۆشی زۆر هەرزانن. منیش وتم: من مەبەستم پارە نییە، دەمەوێ هونەری کورد بگاتە گشت ماڵێکی فنلاندا.

- بەڵام، تۆ لێرە لە کوردستاندا وەك چیرۆکنووس و رۆماننووسێك ناسراویت و بەس؟

- نەخێر، کە قوتابیی قۆناغی دواناوەندی بووم و لە دواناوەندیی کەرکووکدا، جێگری سەرۆکی لیژنەی شێوەکاری قوتابخانەکە بووم. من، سەرەتا بە هونەرمەندێکی شێوەکار ناسرابووم، بەڵام ئەدەب هونەری شێوەکاریی لێ ساندم.

- ئاستی رۆمانی کوردی لە چیدایە؟

- هێشتا ساوایە، بەڵام گەشبینم بە دوارۆژی.

- لە رۆمان.. کورد توانیویەتی کێشە نەتەوەییەکەی پڕ بە پیست تەوزیف بکات؟

- ئەگەر رۆمانی (کۆچڕەو-کۆچڕەو) کە لە ساڵی ١٩٩١دا لە کوردستان نووسیومە و لە فنلاندا هەندێك دەستکاریم کردووە بخوێنیتەوە ئەوە دەزانی، کە چۆن ئێش و ئازاری میللەتەکەمانم پڕ بە پیست تەوزیف کردووە.

- ئەدی لەوەچەی خۆتان؟

- ڕۆماننووسەکانی وەچەی خۆم، هیچیانم بەدڵ نییە، تەنانەت هەوڵەکانی خۆشم زۆر لێیان ڕازی نیم. هەتا دەشمرم، خۆم بە ئەزموونگەر دەزانم.

- چۆن بەرەنگاری غوربەت دەبیتەوە؟

- لەوەتەی هەم، خۆم لەگەڵ خۆمدا غەریبم، غوربەت بۆتە حاڵەتێکی هەمیشەیی لە ژیانمدا، وەلێ دێوەزمەی غوربەتم بەکارکردن و هونەر بەزاندووە. لەوێ کاتم پڕە. هەست دەکەم دەتوانم شتی بەسوود بنووسم.

- کام بەرهەمی خۆتان بە دڵە؟

- (کاولاش) و (سۆناتای ڕۆح) و (کۆچڕەو-کۆچڕەو) هەرسێکیان ڕۆمانن.

- جگە لە نووسین و تابلۆ؟

- حەز لە شوێنەوار و کۆکردنەوەی پارەی کۆنینە و پووڵی هونەری و کتێبی دەستنووس دەکەم. گوێ لە مۆسیقای کلاسیك دەگرم.

- کوردەکانی هەندەران بایەخ بە کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری دەدەن؟

- باوەڕ بکە، بانگەوازێکمان بڵاوکردەوە سەبارەت بە سازدانی چیرۆك خوێندنەوە، کە من و شێرزاد حەسەن و نووسەرێکی کوردستانی ئێران تێیدا بەشداری بکەین. دوای بانگەوازەکەش تەنیا (٣٠) سی کەس ئامادەی کۆڕەکە بوون. هەر کە زانییان کۆڕەکە، گۆرانی و هەڵپەڕکێی تێدا پێشکێش ناکرێ، (زۆربەیان) هۆڵەکەیان جێهێشت.

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# من نووسەرم، خوێنەریش داهێنەرە، بەختەوەریشم



دیمانە: فەرەیدوون سامان

گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٤٥

عەبدوڵڵا سەڕاج، دیارترین نوێخوازی چیرۆکی نوێی کوردییە. خاوەن شێوازێکی تایبەتە لە نووسینی چیرۆك و نۆڤڵێت و ڕۆمانی نوێی کوردیدا. هەروەها لە بواری ڕەخنەی هونەری شێوەکاریشدا هەوڵی بەرچاوی هەبووە. یەکەم کورتە چیرۆکی خۆی بەناوی (ڕاوە گورگ) لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٩)، لە ساڵی ١٩٧٣ بڵاوکردۆتەوە، دواتر زنجیرە وتارێکی شێوەکاریی کە (٣١) وتار بوون لە ساڵانی ١٩٧٣-١٩٧٤ بڵاوکردۆتەوە. سەڕاج یەکێك بووە لەو نووسەرانەی، کە لە بواری دەقی درامیدا یەکەم مۆنۆدرامای بە زمانی کوردی نووسیوە (لاکێشە ڕووناکەکان) کۆچیرۆك بوو لە فەڕەنسا لە ساڵی ١٩٩٥ بۆ زمانی فەڕەنسی وەرگێڕدراوە. وێڕای ئەوەش، شەست وتار (گۆشەنیگار)ی لە (هەفتەنامە)ی (ڕێگای کوردستان)دا و لە (چراخان)دا بڵاوکردۆتەوە. (هەڵکشان بەرەو لووتکە) بەرهەمی یەکەم ڕۆمانی بوو لە ساڵی ١٩٩٠ بە چاپی گەیاند. ڕۆمانی (کاولاش) لە ساڵی ١٩٩٧ لەسەر ئەرکی وەزارەتی ڕۆشنبیریی حکومەتی هەرێم بە چاپ گەیاندووە. بەشداریی کردووە لە کۆنفرانسی نووسەرانی جیهان لە فنلاندا لە لایەن خودی وەزیری ڕۆشنبیری و وەرزشەوەی ئەو وڵاتە (کە شاعیر و هونەرمەندیش بووە) دیوانی خۆی بۆ ڕێزلێنان پێشکێشی کردووەو بەسەر کراوەتەوە. ئەو ماوەیەی لە وڵاتی فنلاندا بووە خەریکی کاری هونەری شێوەکاری بووەو دوو پێشانگای بۆ تابلۆکانی کردۆتەوەو ڕۆژنامەکانی ئەوێ لەسەریان نووسیوەو بە چاکی نرخاندوویانە هەروەها یەکێك بوو لەو ئەندامە چالاکانەی کە ڕۆڵی گرنگی هەبووە لە دامەزراندنی بنکەی کەلتووری پاراستنی گەرمیان و کەرکووك. بە بۆنەی گەڕانەوەی بۆ کوردستان، بە هەڵمان زانی دیمانەیەك لەگەڵ بەڕێزیان ساز بکەین و زۆر لایەنی شاراوەی ژیان و ئەزموونی ڕۆشنبیریی خۆی ئاشکرا بکات.

- پێمان خۆشە وەك سەرەتایەك لە ژیانی خۆتان بدوێن؟

- پڕ بە دڵ سوپاستان دەکەم، کە ئەم دەرفەتەت بۆ رەخساندم، بەڕاشکاوی لە بارەی زۆر شت قسە بکەم و زۆر سوپاسی بەڕێزتان و گۆڤاری کاروان دەکەم، هیوادارم بتوانم گورزە تیشکێك بخەمە سەر ئەو چالاکییانەی، کە لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات نواندوومە.

- عەبدوڵڵا سەڕاج کێیە و بنەچە و رەچەڵەکی چییە؟ ئەگەر دەرفەت هەبێ، باسی ئەزموونی خۆتان بکەن لە بواری نووسیندا؟

- بەڕاستی ئەمە یەکەم جارە لەبارەی ناوی راستیی خۆم و رەچەڵەکمەوە پرسیارم لێ دەکرێ. ئەمن عەبدوڵڵا نەجم مەجیدم ناسراو بە (سەڕاج) و لە بنەماڵەی بابانم، لە پاش قەڵاچۆی میرنشینیی بابان، خێزانی ئێمە بەرەو کەرکووك و دەشتی دزەیی هاتووین. لەبارەی چالاکی و ئەزموونەکانم، ئەوە دەبێ ئاماژە بەوە بکەم بۆ سەرەتاو یەکەم چیرۆك، کە (راوە گورگ) بوو،ساڵی **١٩٧٣** لە ژمارە (٩) گۆڤاری بەیان بڵاوکرایەوە، کە باس لە منداڵێك دەکا، باوکی دیار نییە، دایکەکەی دەزانێ، کە باوکی پێشمەرگەیە، بەڵام دەیویست لێی بشارێتەوە بۆ ئەوەی ئەویش تووشی تەنگژەی دەروونی نەبێ، ئیتر لەوە بەدوا، پێشتریش، کە هەندێ شیعرم دەنووسی، بەتایبەت شیعری گۆرانی، کە دواتر وازم لێ هێنا، ئیتر کەوتمە جیهانی چیرۆکەوەو دواتر جیهانی رۆمانەوە.

- تۆ، ئەندامی باڵای یەکێتیی نووسەرانی کورد بووی ئەوسا، کە بڕیاردرا ناوی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان بگۆڕدرێتە (یەکێتیی نووسەرانی کورد) تۆ بەرهەڵستی ئەم بڕیارەت کرد، بۆچی؟ لەبەر چی دەتانویست، ناوی یەکێتییەکە ببێتە (یەکێتیی نووسەرانی کوردستان) نەك نووسەرانی کورد؟

- ئەوە بۆچوونی گشتی بوو، کە ناوەکە بکرێ بە نووسەرانی کورد. من لەوێش کە دیمانەم لەگەڵدا کرا، لە رۆژنامەی (کۆنگرە)دا گوتم هەردەبێ (یەکێتیی نووسەرانی کوردستان) بێ-وەکو لە شاخدا بووە- دوای ئەوەندە ساڵە بۆیان دەرکەوت ئەگەر نووسەرانی کورد بوایە، خەڵکانی دیکە دەرفەتیان نەدەبوو داوای جیابوونەوە بکەن و

یەکێتیی دیکەی نووسەرانی وەك تورکمان و موسڵمانان دروست بکەن. ئەوکاتە، ئێمە هەموو لەیەك شوێندا کۆدەبووینەوە، بەڵام هەر لایەنە و لێژنەی خۆی دەبوو. ئێمە خۆمان بە هەڵە ئەو ناوەمان (قیت) کردەوەو بە زۆری دەنگیان دایێ. ئێستا هەڵەکە لەبەر چاوە. من هەر لەو بڕوایەدام، کە نووسەرانی کوردستان بێ و جێی خۆیەتی، لێرە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، کە یەکێتییەکەمان تاکە رێکخراوێکە تاکو ئێستا دووچاری پەتای دووبەرەکی نەهاتووە، ئەوەش جێی شانازیمانە.

- بگەڕێینەوە سەر یادەوەرییەکانتان لە دیداری یەکەمی چیرۆکی کوردیدا، بەو چیرۆکە بەشداریتان کرد (٨.٣٠ بەیانی، ٨.٣٠ شەو) کە لە ناواخندا باس لە قەدەغەکردنی زمانی کوردی دەکات (لە شاری کەرکووك) هەروەها لە دیداری دووەمی چیرۆکی کوردیدا، بە چیرۆکی (برایم شۆڕاوی) بەشداریتان کرد، کە ئەویش لە ناواخندا ئاماژە بە لابردن و نەهێشتنی گوندەکانی کوردستان دەکات. ئایا ئەم چیرۆکانە، لە سەردەمی خۆیدا لای رەخنەگران و خوێنەران پێشوازی لێ کراو بەسەر کرایەوە؟ هیچ وروژانێکی لەناو خەڵکدا دروست کرد؟

- کە چیرۆکی (٨.٣٠ بەیانی، ٨.٣٠ شەو)م لە دیداری یەکەمدا خوێندەوە، رەخنەکە ئاشکرا بوو، بەشێوەی رەخنەی رەمزی بوو، کە ئاماژە بەوە دەکات خوێندن بە زمانی کوردی قەدەغە کراوە. لە سەردەمی رژێمیشدا بڵاوکرایەوە، ئەمە لەلایەن خوێنەرانەوە زۆر پەسند کرا، تەنانەت کەسی وا هەبوو، کە جاران گاڵتەی بە من دەکرد، کەچی بۆ ئەم چیرۆکە چەپڵەی لێدەدا. (عیزەددین فەیزی) هاتە سەر شانۆ، بە گریانەوە ماچی کردم و وتی: (ئافەرین کوڕم، ئاوا بنووسە). ناواخنی ئەم چیرۆکەش ئەوەیە، کە مامۆستا لە قوتابخانەدا بە منداڵەکان دەڵێ: (کێ دەتوانێ بنووسێ دار). هەموو وەکو دارستان پەنجە هەڵدەبڕن و دەڵێن: مامۆستا من.. من.. یەکێك دەنووسێ (دار) مامۆستاکە دەڵێ: (ئاسانە نووسینی دار، بەڵام کێ دەزانێ واتای دار چییە؟) یەکێ دەڵێ: دار خورما، ئەوی تر: دارتوو، مامۆستاکە دەڵێ: نەتانزانی. قوتابییەکان دەڵێن: مامۆستا، ساڵی پار خۆت وات گوت. مامۆستا مات بوو. فرمێسك خزایە

چاوانی و دەڵێ: ساڵی پار، دار دارخورما بوو، دارتوو بوو، بەڵام ئەمساڵ دار واتە (خانوو). ئەوە بوو هیچ لایەك لە رۆژنامە و گۆڤارەكانی ئەوسا نەیانوێرا بڵاوی بكەنەوە، بەڵام دواتر بەهۆی كەسێك لە دەزگای رۆشنبیری بڵاوكرایەوە (گۆڤاری رۆژی كوردستان، ژماری ٥٦ی ساڵی ١٩٧٩).

- باشە، ئەم چیرۆكە تا چەند لەلایەنی هونەرییەوە پەسند دەكەی و لەلایەن رەخنەگرانەوە چۆن بەسەركرایەوە؟

- بەڵێ، زۆر بەسەر كرایەوەو بە باشی هەڵسەنگێندراو بە چیرۆكی یەكەمی دیدارەكە داندرا. دیداری یەكەم لە هاوینە هەواری سەری رەش (پیرمام) بوو. دیداری دووەم لە زانكۆی سەلاحەدین بوو، لەوێ چیرۆكی (برایم شۆراوی)م خوێندەوە. بە هەمان شێوە خەڵكەكە بە باشی پەسندیان كرد. ئەمەشیان ئاماژە بۆ ئەوە دەكات، كە منداڵێك لە دایكی دەپرسێ، كە لە دێی (شۆراو) دەركراون و دێیەكە تەخت كراوە. لێرەدا دەمەوێ ئاماژەی بۆ بكەم، كە نووسین و داهێنان و واقیع بە رێكەوت یەك دەگرنەوە. پاش دەیان ساڵ، برادەرێك لە هەولێر، لە بازاڕدا منی بینی و پێی وتم: تۆ دەزانی ئەم چیرۆكەت لەبارەی منەوە نووسیوە. من شۆراویمە و ناویشم برایمەو دەركراویشم. بەسەرهاتی ئەم برادەرە وەك رووداوەكانی ناو چیرۆكەكە بوو. واتا رێكەوت و هونەر و واقیع تێكەڵ یەكتر بوون.

- باشە، تۆ لەو سەردەمە، سەبارەت بە نووسینی ئەو چیرۆكانە، كە لە ناواخندا چیرۆكی سیاسی و بەرگری بوون، تا چەند لەلایەن چاودێران و دەزگا رۆشنبیرییە حكومییەكان دووچاری كێشەو دژایەتی و دژواری هاتی؟

- بەڵێ، زۆرجار بۆ بەغدا داواكراوم. خەرێك بوو بە ئیعدامم بدەن، بەڵام نووسەرێكی ئازای وەك (محەمەدی مەلا كەریم) بەرگری لێ كردم. دەیگوت: تۆ حووتت وتووە. پاڵەوانەكە، حووت قووتی داوە، تۆ مەبەستت رژێمە. جارێكی دیكەش (موسڵح جەلالی) كە ئەوسای بەڕێوەبەری گشتی بوو، وتی: تۆ چاك دەمانشۆیەوە،

جنێومان پێدەدەی. سەبارەت بە چیرۆکەکانم هەندێ کەس ناڕازی بوون و جنێویان پێدام، بەڵام زۆریشیان ستایشیان کردووم.

- گوایە تۆ یەکێك لەو نووسەرانەی دەستپێشخەریت هەبووە، لە دارشتن و دروستکردنی وشە و وشەسازیی زاراوەی نوێ لە زمانی کوردیدا وەك کۆمەڵگە، کۆشیعر، کۆچیرۆك، و جێکات.....تاد، چۆن دەیسەلمێنی، کە تۆ یەکەم کەس بووی ئەو وشانەت داهێناوە؟ بەر لە تۆ کەسێکی دیکە هەوڵی ئاوای نەداوە؟

- ئەمە لە سەرەنجامی ئەوە بوو، کە کۆڕی زانیاریی کورد دامەزرا. ئەوساکە بەر لەمە، من یەکەم کەس بووم، کە وتارێکم لەساڵی ١٩٦٨دا نووسی. وتم: پێویستە کۆڕی زانیاریی کورد دابمەزرێت. دوای دامەزراندنی داوەت کرام بۆ رێنووسی کوردی و بەشداریم کرد. لەوێ پێشنیازم کرد، کە لیژنەیەك دابندرێت بۆ (شێوەکاری) ئەوان باسی زمانی کوردییان دەکرد، باسی شانۆ و مۆسیقایان نەدەکرد-دیارە مەبەستم لە زاراوەکانیانە- ئەز، وەکو شارەزا لە هونەری شێوەکاری، گوتم: ئامادەم خزمەتتان بکەم. دواتر ناچار بووم زۆر وشەو زاراوە بۆ ئەم مەبەستە دابتاشم، کە ئێستا زۆر باوبوونە لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆی کوردیماندا، کەسیش نازانێ ئەمە لە داهێنانی من بووە. لە چیرۆکی (کۆمەڵگای ئاسنین)دا، کە لە ساڵی **١٩٧٣** لە گۆڤاری (بەیان)دا بەکارم هێناوە، بەر لە من کەس وشەی (زاراوەی) کۆمەڵگای بەکار نەهێنابوو، مەبەستیشم لە رژێمی ستالینییەتی ئەوسا بوو، کە رەخنەم لێ گرتبوو. هەروەها زاراوەگەلی وەك: کۆستارە، گۆشەنیگا.....تاد، نووسراوەکانم گەواه و بەڵگەن.

- بە خوێندنەوەی هەندێ لە چیرۆك و رۆمانەکانت بەتایبەتی رۆمانی (کاولاش) یەکێك لە قارەمانانی سەرەکیی ئەم رۆمانە کەسێکی واقعی بووە (وەك من بزانم)، بەڵام تۆ لەم رۆمانەدا کردووتە بە کەسێکی شۆڕشگێڕ. دیارە ئەم کەسایەتییە واقیعییە سەرەتا لە بزاڤی نیشتمانیدا بووە، بەڵام دواتر خزیوەو خۆی دۆڕاندووە، کەچی تۆ تا کۆتایی ئەم رۆمانە، لایەنی سەلبی ئەم کەسایەتییە نیشان نادەی، بۆچی؟ مەبەستێك لە پشت ئەم رووداوە هەیە، کە نەتوانی بە ئاشکرا باسی لێوە بکەی؟

- یەکێك لە خاسیەتی ئەو ڕۆمانە ئەوەیە (فرەدەنگی)یە، ئەوجا کەسایەتییەکان، هەر یەکەو بە گوێرەی شوێن و کاتی خۆی (جێکات) گرنگییان هەیە. یەکێ لەوانە دەخزێ، بەڵام ناکرێ من هەموو کەسایەتییەکان وەکو فیلمی هیندی هەموو باش و سەرکەوتوو بن. لێرەدا، ئاماژە بەوە دەکەم، کە نووسەر وەك (ئەفراندەر)ی نووسین وایە، وەك خواوەندێکی بچووك وایە، کەسەکان دروست دەکات. ناکرێت لە هەموو ڕۆمانێکدا، پاڵەوانەکانم چاك بن. نە ڕەش هەیە هەتا سەرو نە سپی. کەسایەتیی ناو ڕۆمان، گەشە دەکەن، هەریەکەو دارێك دەژێنێ، کە زۆر گەشە دەکات و بەربدات، لەوانەشە تووشی نەخۆشی بێت. کرم و حەشەرات لێی بدات. ئەوە بەدەست نووسەر نییە، بەڵکو ڕەوتی ڕۆمانەکە خۆی دەیسەپێنێ، بەڵام ئەو کەسایەتییەی، تۆ باسی دەکەی، ڕاستە لە سەرەتاوە شۆڕشگێڕ بوو، بەڵام دواتر خۆی دۆڕاند، بەم شێوەیەش نییە، کە تۆ ڕەخنەی لێ دەگری، بەڵکو چاك ئیدانەم کردووە.

- دێمەوە سەر شێوازی نووسین و لایەنی تەکنیکی و داڕشتن لە نووسینی چیرۆك و ڕۆمانەکانت، کە مەبەست بە سانایی بەدەستەوە نادەن و کەسایەتییەکان خۆیان یەکلا ناکەنەوە، یان بڵێم بە سانایی ڕووداوەکان خوێنەر ناورووژێنن، ئەم زمانەی دەربڕینەی تۆ، کە پێی دەنووسی وشك نییە؟

- نووسەر هەمیشە دەبێ زمانی دەربڕینی تایبەتیی خۆی هەبێ و نابێ ئەوەندە بێتە خوارەوە، گوایە خەڵك بە ئاسانی تێی بگا. دوای بڵاوکردنەوەی هەر چیرۆکێك، یان ڕۆمانێکم لە هەندێ کەسیم پرسیوە، وتوویانە: تێی ناگەین. منیش گوتم: لە تابۆیەکی پیکاسۆش ناگەن؟ جا مەبەست لێرەدا، ئەوە نییە خۆت ئەوەندە ئاسان بکەیتەوە تا خەڵکی تێتبگا. من دەمەوێ ئەو خوێنەرە بگاتە ئاستێك لە ڕۆشنبیری، تا بتوانێ بەرز بێتەوەو لێی حاڵی بێت. هەڵبەت دوو سێ جۆر خوێنەر هەیە، هەریەك لە پلەی خۆی دەخوێنێتەوە وەك تابلۆیەکی سروشتی، کە سەیری دەکا، هەریەك بەگوێرەی خۆی دەیخوێنێتەوە، بەڵام تابلۆکە، لە بنەڕەتدا هەر هەوەو بوونی هەیە. ئەدی ڕەخنەگر بۆ چییە؟ دێ باسی ئەو نووسینە، یان ئەم تابلۆیە دەکات و ڕوونی

(شی) دەکاتەوە. دواتر هێماش بۆ نووسەر پێویستە وەك لایەنێکی هونەری و تەکنیکی، کە سیمای نووسینەکەی پێ دابڕێژێ.

- تا چەند بۆ نووسینی چیرۆك و رۆمان کەڵکتان لە کەلەپوور و فۆلکلۆری کوردی وەرگرتووە، ئەگەر بکرێ دەستنیشانی ئەو چیرۆك و رۆمانە بکەن، کە زیاتر داب و نەریتی کوردەواری و ئەفسانە و هەقایەتە میللییەکانتان تێدا تەوزیف کردوون؟

- زۆر کەڵکم لە داب و نەریتی کۆمەڵایەتی کوردەواری وەرگرتووە، زیاتریش دەستنیشانی ئەو رۆمانە دەکەم، کە (هەڵکشان بەرەو لووتکە)یە. هەندێ نامە لە برادەران و رەخنەگران بۆم هاتوون باس لەو رۆمانە دەکەن، کە سوودی زۆرم لە فۆلکلۆری کوردی وەرگرتووە، وەك داب و نەریت و رێساو قسەی نەستەق، هەندێ کەسیش بە ئیجابی باسی لێوە دەکەن، کە کوردایەتیی کەرکووکیان پاراستووە. ئاشکرایە هەموو ئەدەبیاتی جیهانی دەبێ رەگوڕیشەی لە کەلەپوورەوە هەڵقوڵاو و داکوتاو بێ، بەڵام بەشێوەیەکی سەردەمانە تەوزیف بکرێ، لەبەر ئەوەشە، لە رۆحی کوردەوارییەوە شت وەردەگرم و بە تەکنیك و شێوازی تازە دایدەرێژمەوە.

- باشە، چۆن توانیت تەوزیفی هونەری شێوەکاری بکەی لە چیرۆکەکانت؟

- لە قۆناغی ناوەندیدا (رەسام) بووم، هەتا میدالی زیوینم ساڵی ١٩٥٢، لە موتەسەریفی ئەوسا (رەشید نەجیب)ی شاعیری نوێکەرەوەی نەوەی (گۆران) وەرگرت، بەڵام ئیتر دوای ئەمە، ئەدەب رایکێشام و وازم لە شێوەکاری هێنا، هەروەك (زاهیر رۆژبەیانی)ی رەخنەگر لە کتێبەکەی ئاماژەی پێدەکات. من، بە نووسین تابلۆ دەکێشم بۆ خزمەتی ئەدەبەکەم، تەنانەت هەندێ تیۆری هونەریشم داناوە، بۆ وێنە، لە رۆمانی (کاولاش)دا تیۆرێکم داناوە، بەڵام هەستی پێ ناکرێ. هەتا ئێستا رەخنەگرێك نەیتوانیوە، یان نەیوێراوە خۆی لێ بداو بڵێ ئەو تیۆرە چییە. ئەوە لە ئەوروپا بوایە، دیراسەیان دەکرد. لە بارەی رەنگەوە دەڵێم: سێ رەنگ هەیە (سوور، شین، زەرد) ئەز گوتوومە: رەنگی زەرد رەنگێکی بنەڕەتی نییە، هەروەها: (رەش و سپی) رەنگ نین. حەزدەکەم روونی بکەمەوە، بۆچی سپی و رەش لای هونەرمەندان، رەنگە. من دەڵێم:

ڕەنگ نییە. ئەوەندە پێویستە دەبێ باس بکرێ، لە ئاکادیمیای هونەرەکاندا هەموو ڕەنگەکان لە تیشکی خۆرەوە بۆمان دێ. لە قۆناغەکانی خوێندن خوێندوومانە، ئەگەر بێ و هەموو ڕەنگەکان لەسەر مقەوایەکی (کارتۆن) خڕ دابنێین و بە توندی بیسووڕێنین، ڕەنگەکان گشت تێکەڵ دەبن و دەبنە (سپی). دواتر، ئەگەر گشت ڕەنگەکان تێکەڵ بکەی، لە کۆتاییدا دەبنە (ڕەش) کەواتە ڕەنگ نامێنێ.

- باشە، چۆن مامەڵە لەگەڵ زمان دەکەی بۆ نموونە: داڕشتنی زاراوە، یان پێکهاتەی سادە لە چیرۆك و ڕۆماندا؟ بەو حسابەی تۆ لەو نووسەرانەی، زۆر بایەخ بە زمان دەدەن؟

- بنەڕەتی هەموو ئەدەبێك، بە شیعر و چیرۆك و ڕۆمانەوە، زمانە. زمانەکەی پاراو نەبێ و بەهێز نەبێ، جودا نەبێ، کەواتە هیچت نەکردووە، کە چیرۆکم دەنووسی، سەرەتای نووسینم بوو، لیستێکم ئامادە کرد تا بزانم چ وشەیەکم نووسیون، کە پێشتر بەکارم نەهێناون، یان زاراوەیەك و لێکچواندنێکم کردووە نائاساییی بێت، خوێنەر ڕاچڵەکێنم. من، لەجیاتی ئەوەی بڵێم: (کەسەکە لە شەقام پەڕییەوە). دەڵێم: (شەقامەکەی سەربڕی.) ناڵێم: (ئاسمان شینە). دەڵێم: (ئاسمان مەرەکەبی تۆخە). واتە هەمان لێکچواندن بەشێوەی نائاسایی، کە وا لە خوێنەر بکەی هەست ڕابگرێ و هەڵوێستە بکات و بیر بکاتەوە. دەمەوێ خوێنەر لەگەڵ مندا بیربکاتەوە. من نووسەرم، خوێنەریش داهێنەرە. من بە زەوقی خۆم دەنووسم، بەڵام بەختەوەریشم یەکێ تێم بگات، مەگەر چەند ژمارەیەك کەس هەبن نەتوانن، یان نایانەوێ تێمبگەن. لە ساڵی ١٩٧٠وە هەتا ئەمڕۆکە، کە سی ساڵە، ژمارەی خوێنەرانم تا دێ زیاتر دەبێ، واتە ئەو ڕێبازەی گرتوومە سەرکەوتووە. من، کە دەڵێم: بە زەوقی خۆم دەنووسم، مەبەستم ئەوەیە، نووسینەکەم لە بەرژەوەندی میللەتدایە، بەڵام لە شێواز و ئاستی هونەریشم دانابەزم تا خەڵك تێبگەیەنم. ئەوە کاری ڕەخنەگرانە.

- باشە، بۆچی کات لای تۆ نهێنییە و تێهەڵکێشە؟ چاکتر وایە بڵێم: یەکتر بڕە بەتایبەتی لە دوا ڕۆمانت (کاولاش) ئەگەر بکرێ تیشکێ بخەیتە سەر ئەم بۆچوونە؟

- پاش ٣٠ ساڵی تاقیکردنەوە لە نووسین گەیشتم بەوەی، زەمەن یەکتربڕە، کە ئاینشتاین سەلماندوویەتی، زەمەن واتا جوولانەوە، جوولانەوەش واتا جوانی، بەڵام وەستان مەرگە. هەرچەندێ جوولانەوە هەبێت جوانی بەخشە، دەتوانم بڵێم: ئازادی و شۆڕشگێڕییە. کات جۆری هەیە، کاتی فیزیکی وەك: سەعات و وەرزەکان و ساڵ دەژمێردرێت، بەڵام کاتی (وجوودی)یش هەیە، کەوا من و تۆ دانیشتووین، دوو سەعات پێکەوەین، کاتێکی خۆشەو هەستی پێدەکەین وەکو دەقیقەیەکە. کەچی لەگەڵ کەسێکی دی دادەنیشی وەزعت ناخۆشبێ، دەقیقەکەت لێ دەبێتە ساڵێك. ئەمە زەمەنە وجوودییەکەیە. زەمەن هەیە، هیچ پەیوەندیی بە زەمەنی رۆحییەوە نییە، بەڵام چڕیی زەمەنەکانم-وەکو لە کاولاشدا بەڕێزتان ئیشارەتتان پێکرد- زەمەنێك هەیە، لە سەرەتاوە بەرەو کۆتایی دەچێت، لەوێ کەسی یەکەمی رۆمانەکە (هیوا)یە-رەمزی هیوای دواڕۆژە- لەوێ، لە (چیمەن) لەگەڵ دایکیدا دەردەکرێن، دێتە شارو شار وێران دەکرێ، کەچی خۆشی لە کۆتاییدا بۆتە رۆماننووس و دەگەڕێتەوە گوندەکەی. واتە: کۆتایی بەرەو سەرەتا دەگەڕێتەوە، پاش ئەوەی (یازدە) جار، دایکی لە گۆڕستان هەڵدەستێنێ و باسی چیمەنستانی بۆ دەکات. ئەو دوو زەمەنە، زەمەنێك لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی، زەمەنی دووەم لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتا... زەمەنێکیش هەیە یەکتربڕی دەکەن، یان تێهەڵکێش دەبن. من هیچ گوێم نەدەدایە زنجیرەی زەمەنی، واتە: رووداوێك لە ساڵی١٩٩٠دا روویدابێ، من یادی رووداوێك دەکەم، لە ساڵی ١٩٨٠ روویداوە. هیچ زنجیرەیەکی زەمەنی لەلام نییە. زەمەنی ریوایەت (گێڕانەوە) هی پێویست کردنە و زەمەنییە. لەوانەیە: دەگەڕێتە دواوە، یان تەداعی دەکات، یان تەکنیکی زۆری دی هەیە... تەکنیکی سینەمایی هەیە، تەکنیکی کارای شێوەکاری، شانۆیی، کە بۆت هەیە هەمووی لە رۆمانی نوێدا بەکاربهێنی.

- باسی تەداعیتان کرد تۆ چۆن پێناسەی تەداعی دەکەی، هەروەها لە رۆماندا، چەند جۆرە تەداعی هەیە، چونکە تا ئێستا زۆر لە نووسەرانی ئێمە فلاشباك وەك تەداعی بەکاردێنن. بەڕای تۆ جیاوازی لە نێوان تەداعی و فلاشباك نییە؟

- کەم کەس دەزانێ واتای تەواوی تەداعی چییە؟  فلاشباك Falshback وەك گەڕانەوەیە، بەڵام تەداعی حاڵەتێکی نووسەرە لە مێشکیدا بیردەکاتەوەو لە بەینی ئەوەی دەنووسیت. لە بەینی هەردووکیاندایە، نە بۆتە وشە و نە بۆتە بیرکردنەوە، واتا لەو حاڵەتە مامناوەندییە، یان لە بەینی نووسین، یان وشە و قسەکردن بۆیە پچڕپچڕە، بە نموونە: کە قسە لەگەڵ مندا دەکەی، بیرت لەلایەکی دیکەیە و لێشاوی (بیر+وشە) لە هۆشتدا جموجوولێیانە، ئەمە جۆرێکی تەداعییە، بۆیە نووسین دەبێتە قسەیەکی (کلام) ئاسایی، یان بیرت کردەوە دەبێتە تەکنیك لەو حاڵەتەدا. تەداعی هەیە (شوێنی)یە. تەداعی هەیە (کاتی)یە. بە نموونەی تەداعی جیَ: کەسێك لەسەر ئاوێك راوەستاوە، یەکسەر بیردەکاتەوە، بۆ نموونە: لە پاریس، یان لە رۆخی (پسفۆر)ە (کە لەوێ بووم، ئەوەم لەوێ دی) واتە بیر لە جێگەیەك دەکاتەوە کە بەرەو جێگەیەکی دیکەی دەبات. تەداعیی کاتیش ئەوەیە یەکسەر دەڵێ: (باوکم دەیگێڕایەوە..) یەکسەر دەگەڕێتەوە بۆ زەمەنێکی دیکە، کە رابردووە. من، زەمەنێکی دیکەم واتا تەداعییەکی تازەی خۆم داهێناوە بۆ نموونە، لە رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە)دا پاڵەوانێك لە پاڵەوانەکان وا تێگەیشتووە، کە دەبێ چل نوێژی بەیانی لە مزگەوتی دانیال پێغەمبەر بکات بۆ ئەوەی خدری زیندە ببینێ، تا ئاواتەکانی بەدی بێنێ. چلەمین رۆژیەتی، کە خڕی (خاسە) دەبڕێت، قەدبڕ، بۆ قەڵای ئاراپخای کەرکووك دەڕوا. ئا لەوێ نوێژ دەکا. وشەکانی زۆر دووبارە دەکاتەوە، چونکە لە حاڵەتی تەسەوفی زۆر قووڵ و گەورەدایە. سڵاو بەملاو بەولادا دەکا، بەڵام خدری زیندە وجوودی نییە. هاوار دەکات و دەست دەکاتە گریان و شێت دەبێ. هەر هەمان شەو لە شاری باوەگوڕگوڕ و گاورباخی، برووسکەیەك لە دار زەیتوونێ دەدا و وێرانی دەکا. ئەوجا، لە رێگە حاجی لەقلەق دەبینێت، کە گڕە لێی داوە و بەو بەیانییە، لەوێ کەوتووە، بیری لێ دەکاتەوەو دەڵێ: حاجی.. حاجی. یەکسەر چاو هەڵدەبڕێ و سینەمای (خەییام) دێتە بەرچاوی. وشەی حاجی لەقلەق، حاجی خورشیدی حەلواچیی خستەوە بیری، بەمەش دەڵێم تەداعیی لەفزی.

- ساڵی ١٩٩٧ لە ٦/١٤ تا ٦/١٨ لەگەڵ شێرزاد حەسەنی چیرۆکنووس، بەشداری کۆنفرانسی جیهانیتان کرد لە فنلاندا. پێمخۆشە باس ئەو کۆنفرانسە بکەن و چۆن بەشداریتان کرد و چیتان کرد، چ بەرنامەیەکتان پێشکێش کرد، ئەگەر باس لەو یادگارییانە بکەن؟

- هەڵبەتە پێش ئەوەی بگەینە فنلاندا، نامەمان بۆ هاتبوو، کە خاڵی سەرەکیی کۆنفرانسەکە: (زمانی نووسەرو. کەسایەتییەکان چۆن لە بەرهەمەکانیاندا رەنگیان داوەتەوە) بە گوێرەی ئەمە، نووسینێکم بە کوردی نووسی، پاشان بۆ عەرەبیم وەرگێڕا. لەگەڵ شێرزاددا گەیشتینە دوایین رۆژی کۆنفرانسەکە و گەشتێکی ناو گۆلی لاهتی-کە شارەکەی بە ناوەوەیە- پاش ئەوەی، کە گرفتێکی زۆر هاتە رێمان. (ئەوەی بۆ ئێمە کرا، لەوەپێش بۆ کەس نەکراوە، چونکە گەمارۆ هەبوو لەسەر پاسەپۆرتی عێراقی، بەهەر حاڵ، بەیانییەکەی گەیشتین. هەموو نووسەرانی جیهان، کە لەوێ بوون، ئامادە بوون کۆنفرانسەکە تێکبدەن و بچنە بەردەم سەفارەتی ئەڵمانیا و نارەزایی بەرانبەر نەگەیشتنی ئێمە دەربڕن، بەڵام خۆشبەختانە شەوی رابردوو گەیشتینە فرۆکەخانە، سکرتێری نووسەرانی ئەوێ لەگەڵ (رەهبەر جەلال)دا بە گوڵێکی سوورەوە، پێشوازیی لێ کردین و هەر هەمان شەو، لە هێلسنکییەوە ئێمەیان بردە شاری لاهتی Lahti. (کۆنفرانسەکە لە موکولا Mukkula دەگێڕدرا) دوایین رۆژی کۆنفرانس بوو، ئەوە بوو سەرۆکی نووسەرانی فنلەندە گوتبووی: کۆنفرانسەکە تێك مەدەن، دەچم هەموو کارێك ئەنجام دەدەم. کاتمان پێدرا بۆ ماوەی دە دەقیقە قسە بکەین، دوایی پێنج شەش دەقیقەشمان بۆ زیاد کرا. رۆژنامەکانی ئەوێ نووسییان: (ئەم پێنج رۆژەی رابردوو هیچ نەبوو (فشە بوو)، بەڵام کە ئەم دوو نووسەرە گەیشتن جدییەت کەوتە ناو کۆنفرانسەکەوە.)

- ئەو سۆز و خۆشەویستییە چی بوو بەرانبەر ئێوەیان نواند؟

- دەیانزانی، ئێمە گەلێکی چەوساوەین و زوڵمان لێ کراوە. ئەنفال کراوین، تەنانەت نووسەرێکی گەورەی ژاپۆنی باوەشی پێداکردم و بە گریانەوە گوتی: (چۆن

دەبێ مرۆڤێکی نووسەر حەڤدە رۆژ دوابکەوێ). من گوتم: کاکی خۆم سەدو هەشتا هەزارمان لێ ئەنفال کراوە. لێم تووڕە بوو. گوتی: ئێوە مرۆڤی باش نین، بۆ ئەو رژێمە ناگۆڕن؟ ئەدی بۆ دەنگ دەدەن بە سەدام؟ وتم: دەبێ زۆر باش تێبتبگەیەنم، زرووفی ئێمە و ژاپۆن زۆر جیاوازە، بەڵام ئەم زۆر هاودەردیی خۆی نیشان دا. دواجار لە ماڵی (رەهبەر جەلال)، ئۆمەری دزەیی پەیوەندیی لەگەڵدا کردین بۆ قسەکردن لە رادیۆی دەنگی ئەمەریکا، (بەشی کوردی) هەستمان کرد، ئێمە وجوودێکی باشمان هەیە. شێرزاد حەسەن وتەیەکی بە زمانی ئینگلیزی پێشکێش کرد، منیش لەگەڵ هونەرمەندی نەمر (رەهبەر جەلال)دا بە سەد دانە نووسینەکەم فۆتۆکۆپی کرد و دەسبەجێ بەسەر بەشداربووانی کۆنفرانس دابەشمان کرد، رۆژی دوایی، کە رۆژی خەڵاتکردن بوو، لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە لەسەر کەشتییەك بووین لە گۆمێك کۆیانکردینەوە. لەوێ بە هەڵمان زانی، کاك رەهبەر بەخۆی و گیتارەکەی سروودی (ئەی رەقیب)مان چڕی. گشتیان لێمان ئالاّن و چەپڵەیان لێدەداو یەك بە یەك لە باوەشیان دەگرتین و ماچیان دەکردین. شتێکی جوانمان نیشانی خەڵکەکە دا. دوایی رەوانەی شاری (تامپرێ Tampere)یان کردین. لەوێ، من و شێرزاد دە مانگ پێکەوە ماینەوە، بەڵام دواجار ئەو بڕیاری دا بگەڕێتەوە کوردستان و من نەگەڕامەوە.

- پێمخۆشە باس لە ئەزموونی خۆتان بکەن لە وڵاتی فنلاندا، بەتایبەت لەبارەی ئەو دوو پێشانگا شێوەکارەی کە لەوێ کردتانەوە بە چەند تابلۆ بەشداریتان کرد تا چەندیش لەلایەن جەماوەر و رۆژنامەکانی ئەوێ پەسند کران؟

- کە لە وڵاتی فنلاندا مامەوە و پەنابەریم وەرگرت، فەراغێکی زۆرم هەبوو، ناچار بووم ئەو بۆشاییيە بە رەسمکردن، بە شێوەکاری پڕ بکەمەوە. ئەوە بوو بە (٦٠) شەست تابلۆ، لە پێشانگەی یەکەم بەشداریم کرد و بەنرخێکی زۆر هەرزانیش، چەند تابلۆیەکم فرۆشت، کە مایەی سەرنجڕاکێشانی رەخنەگرێکی ئەوێ بوو، گوتی: بۆ وا هەرزانە؟ من وتم: هیچ مەبەستێکی مادیم نییە، تەنیا ئەوەندە نەبێ، گەرەکمە تابلۆکانم (کە باس لە مەسەلەی رەوای کورد دەکەن) بگاتە ناو ماڵی تۆیی

ئەوروپاییەوە لەوێدا، لە ڕۆژنامەی (ئامولێهتی)دا دیمانەم لەگەڵدا کرا، دوای ئەمە. برادەرێك هات و خۆی پێ ناساندم وتی کوردێك هەیە بچن پەیوەندیی پێوە بکەن. دەیناسم و مێردەکەی سورییە، سبەینێ دێ و پەیوەندیت پێوە دەکات. ئەوە بوو هات و منی بردە ماڵەوەو دوای داوەتکردن، چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کردم. چاوپێکەوتنەکەم بە زمانی ئینگلیزی کرد. عینوانێکی زۆر جوانی نووسیبوو. من نەمزانی ئەم ڕۆژنامەیە کەوتۆتە بازاڕەوە، هەر یەکێ منی دەدی، پایسکلەکەی ڕادەگرتم و دەیگوت: (ئامولێهتی..)، کە ناوی ڕۆژنامە بەر بڵاوەکەیە، هەستم کرد دیمانەکە بڵاوبۆتەوە، چووم سەیرم کرد نووسراوبوو (مەلێکی کوردستان لە تامپرێ نیشتۆتەوە).

Kurdistanin Lintu Lensi Tampereelle

ناونیشانێکی زۆر جوان بوو، زۆر بە شیعرییەت نووسیبووی.

- ئاماژەتان بە ئامادەبوونی هونەرمەندی شێوەکار و ڕۆژنامەنووس (ڕەهبەر جەلال)ی نەمرد کرد، پێمان خۆشە باسی پەیوەندیی خۆتان لەگەڵ ئەم هونەرمەندە مەزنە کۆچکردووە بکەن، ڕۆڵی ئەم هونەرمەندە لە وڵاتی فنلاندا لەو چەند ساڵەی کە (١٧-١٨ ساڵێك لەوێ بوو) چی بوو لە بە چاپگەیاندنی گۆڤارێکی وەکو (دلانپار) هەروەها لە بواری ڕۆژنامەوانی، بواری هونەری شێوەکاری؟

- بەداخەوە، پێشتر نەمدەناسی، ساڵانی زوو لە پێشانگایەکی چیاکاندا بینیم و هانم دا، بەڵام لەبیرم نەمابوو، ئەو بەبیری هێنامەوە، ڕەهبەر مرۆڤ بوو، دەتوانم بڵێم بە مردنی ئەو کۆستێکی گەورە لە ئێمەی کوردی فینلەندە کەوت. هۆڵی (کایسا C. A. I. S. A)ی جیهانی، هەتا ئێستا، لەوەتی ئەو مردووە، یەك چالاکی لێ نەکراوە. بە تەماین چالاکی تێدا بکەین. دەستمان پێکردووە، دوای مردنی ئەو، (دڵانپار) لە کار وەستا، گۆڤارێك بوو هەتا ئێستا نازانم چەند ژمارەی لێ دەرچووە، بەڵام لە سەرووی (٢٠) ژمارە بووە. من و شێرزاد لە ماڵی ئەو دەخەوتین. ئەو شەوانە تا بەربەیان نەدەخەوت، هەر تەقەی کۆمپیوتەری دەهات. هەندێ نووسەر یارمەتییان دەدا، ئێمەیش چیرۆکمان تێدا بڵاو دەکردەوە. کۆڕی سەد ساڵەی حاجی قادری کۆییمان

پێکەوە گێڕا. وتارێکیان بۆم نارد، پاش مردنی، ژنێك کە رێکخراوێکی هەیە، هاتە لام و گوتی: لەبارەی رەهبەر بە ئینگلیزی شتێکی جوان نووسراوە، بۆ بلاوی ناکەیتەوە؟ وتم: بمدەرێ. زۆر مەمنوونم، چی بۆ رەهبەر بکەم هێشتا هیچم بۆ نەکردووە، چونکە رەهبەر مرۆڤێکی گەورە بوو، دواتر ناردم و لە سوید لە بلاوکراوەی (چراخان)دا لەوێ بلاوکرایەوە. (دلانپار) بەڕاستی گۆڤار بوو، ئێستا ئێمە لەجێی ئەو دەنگی کوردمان دەرکرد. لەم ژمارەیەی بێتەوە، نووسینمی تێدایە، هیواردام جێی ئەو بگرێتەوە.

- باشە، چۆن بوو هیچ بەرهەمێکی خوالێخۆشبوو رەهبەر جەلالتان لەگەڵ خۆتان بۆ هەولێر نەهێنایەوە تا وەك لایەنێکی ئەرشیفی بیپارێزین وەك تابلۆیەك، یان چەند دانەیەك گۆڤاری (دلانپار)؟

- زۆر کەس وادەزانن، کە رەهبەری خوالێخۆشبوو تەنیا رۆژنامەوان بوو، بەلام کەس نازانێ دوو شەهادەی هەیە، یەکێکیان لە (یۆگسلاڤیا) و ئەویتر لە (مۆسکۆ)، ماجستێری هەیە لە شێوەکاری، جوانترین شانۆنامەشی نووسی لەسەر هەڵەبجەی شەهید. من لە نامیلکەیەکی بچووکدا خوێندمەوە. دەڵێم رەهبەر رەمزی کوردایەتی بوو لە پاش ناشتنی لە ئەوروپا (هێلسنکی) ٢٠٠ دووسەد کەس زێتر بۆ سەر گۆڕەکەی هاتن و بە سروودی (ئەی رەقیب) ناشتمان، تەنانەت نەیارەکانیشی ستایشیان دەکرد، هەستیان کرد (رەهبەر جەلال) لە ئێمەی کورد، لە ئێمە چوو، من، کە دوایین شەوانی، چوومە لای، لە یادمە ژنەکەی دەیگوت: خەڵك ناناسێ، بەلام زۆرم لە ژنەکەی کرد. کە بچمە لای، هەردەبێ بیبینم. چوومە لای، منی ناسی، بەلام نوتقی نەمابوو بە پەنجە ئیشارەتی بۆم کرد، چوومە پێشەوە. دەستمی گوشی و قسەی بۆ نەکرا، منیش قورگم پڕ لە گریان بوو. دوایین جار ئێمە چووینە دەرەوە، دکتۆر نەیهێشت سەردانیی بکەین، چونکە لە گیانداندا بوو. ئەو ساتە زۆر حەزی بە گۆرانیی (کراس زەردێ) دەکرد. دەیگوت با برادەران گۆرانیی کراس زەردێم بۆ بڵێن، بە قورگی

پڕ لە گریان و بە چاوی فرمێسکەوە، کراس زەردێمان بۆ گوت و لەنیوەی گۆرانییەکەدا گیانی سپارد.

- ڕۆژنامەکانی ئەوروپا زۆرجار ڕەخنە لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگرن بەتایبەتی کورد ئەوانەی ماوەیەکە وەکو جالیە لە ئەوروپا ئەوانە دوای ئەوەی پەنابەری وەردەگرن ئیدی واز لە داب و نەریت و کولتوور و هەتا زمانی خۆیان و ناوی منداڵەکانیان دێنن، بەڵام هونەرمەندێکی وەك (ڕەهبەر جەلال) خێزانەکەی فنلەندی بوو، کوردیی نەدەزانی کەچی کەمێ فێری کوردی بوو. هەرسێ منداڵەکەشی بە کوردی قسەیان دەکرد هەتا ناوەکانیان کوردی بوون ئەمە خۆی لە خۆیدا هەستی نیشتیمانپەروەری و کوردانەی ئەو مرۆڤە گەورەیەی نیشان دەدا؟

وەکو وتم ئەگەر بە سەعاتیش باسی ڕەهبەر بکەم بۆم تەواو ناکرێ. ئەو ژنە مەزنەی فینلاندی بوو، بە ئینگلیزی قسەیان دەکرد، لەگەڵ یەکدی و لەگەڵ ئێمەشدا، بەڵام ئەو منداڵانەی یەکەمیان (ڕۆژە)خان، دووەمیان (کوردستان) ئەگەر بێتو قسەیان بە فینلاندی بکردبایە، ڕەهبەر دەیگوت: وا مەڵێ وەها بڵێ، بە کوردی دەیگوت: دەی سێ جار بیڵێرەوە. ڕۆژێکیان بە ژنەکەیم وت: ئەرێ ئێمە بێزارمان کردوون، لە ژووری منداڵەکانتان دەخەوین. وتی: ئێوە ڕەهبەر ناناسن. ئێوەش نەبن. دەچێ لە بازاڕ کورد دەهێنێ. ئێرە ئوتێلی کوردستانە و بە ئیسراحەت دانیشن، جێێ خۆتانە. ئێمە لەوێ بووین کچی سێیەمی بوو. لەسەر داوای ڕەهبەر، من ناوم نا (ئاسمان) ئەوەبوو لە ڕۆژی ناشتنی وشەیەکم خوێندەوە (بە کوردی و چوار پێنج دێڕیشی ئینگلیزی) (عەبدوڵڵا پەشێو)ی شاعیر، ئەویش-لەسەر تەرمەکەی- وتەیەکی خوێندەوە، هەروەها کەسانی تر شتیان خوێندەوە.

- دەگەڕێینەوە سەر ئەزموونتان لە بواری ڕەخنە لەبارەی هونەری شێوەکاری. هەڵبەت کاتی خۆی جەنابتان لە هەولێر بوون ماوەی ئەو ٢٠ ساڵە تۆمان وەك چیرۆکنووس و ڕۆماننووس و ڕۆشنبیرێك ناسیوە نەمانزانیوە تۆ لە بواری هونەری

شێوەکاری کار دەکەی. واتە بەرهەمت هەیە چۆن توانیت دوو پێشانگە لە فینلاندە بکەیتەوە؟

- ناوەندیشم تەواوکرد، جێگری سەرۆکی لیژنەی شێوەکاریی ئامادەیی کەرکووك بووم، کە تاقە ئامادەیی بوو لە ساڵانی ۱۹۵۰-۱۹۵۱دا لەم ساڵانەدا، ئەوسا لەگەڵ مامۆستاکەمان (مەحموود ئەلعوبەیدی) ئێستاش ماوە، لەگەڵ کوڕێکی ئەرمەنی (لیۆن) دەچووینە (چوارباخی) گاورباخی، ئەوان بە (زەیتی) منیش بە (ئاوی) ڕەسممان دەکرد. من لەو کاتانەدا، کە قوتابی بووم، لە ڕۆژنامەی (سەر دیوار) بە عەرەبی شتم نووسیوە. لە پێشانگەی ساڵانە، مامۆستاکەم پلەی سێیەمی وەرگرت، من دووەمم وەرگرت، کە پۆرترێتی (غاندی)م بە مەرەکەبی چینی کێشابوو. (ڕەشید نەجیب)ی مەتەسەریفی ئەوکاتە، مەدالیای دوومی زیوینی دامێ. دوای دە ساڵ زانیم ئەو ڕەشید نەجیبەیە، کە لەگەڵ (گۆران)ی شاعیردا هاوڕێ بوون، بەڵام ئێستاش لە یادمە، دەستی خستە سەر شانم و بەهێواشی وتی: تۆ کوردی؟ وتم: بەڵێ. وتی: ئافەرین. لە ساڵانی حەفتاکاندا (۳۱) سی و یەك وتاری شێوەکاریم نووسی. دامنابوو ٦۰-۷۰ شەست حەفتا وتار بنووسم، واتە لە چاخی ئەشکەوتەوە بیهێنمە خوارەوە تا ئەمڕۆی خوێندن، بەڵام (حەمید عەزیز) کە ئێستا دکتۆرای لە فەلسەفە هەیە بووە کۆسپ و (ئیستفزاز)ی کردم. ئەوسا لە دەزگای ڕژێم بەرپرس و کاربەدەست و دەمڕاست بوو. چوار وتاری ئامادەشم هەبوو، لە داخان ڕووبەڕووی هەموویم دڕاند. ئیتر وازم لەو زنجیرە نووسینە هێنا. بەڕای کاك ئیسماعیل خەبات و هەندێ لە هونەرمەندان وتیان: پێش تۆ، کەس ئەوەندە باسی شێوەکاریی نەکردووە. ئینجا تابلۆکانی من، بەس لەسەر کارتۆنی ڕەش نمایشم کردن. ڕەسام نییە (١٦) شازدە تابلۆی فرۆشتبێ، پێشتریش باسم کرد. تابلۆکانیشم زۆر هەرزان فرۆشت.

- ناوەرۆکی تابلۆکانت پەیوەندی بە دۆزی کورد و کولتوور و میسۆلۆژیای کوردەوە هەیە؟

- میتۆلۆژیای کوردی وەکو چیرۆکی ئەفراندنی (ئێزدی و کاکەیی) و مەلەك تاوس و (زەوی لەسەر شاخی گایە و گا لەسەر ماسییەو..) ئەو جۆرە بابەتانەم دروست کردووە. کچی کوردستانم رەسم کردووە بە گۆزەی سەرشانەوە، شوان و.. وەلی دێوانەو.....تاد، ئەوانە وەکو شێوەی واقعی پێیان خۆشە. میتۆلۆژیای مەسیحیشم کێشاوەو رەخنەشم لێیان گرتوون. لە خیلالی تابلۆکانەوە، زۆربەی کارەکانم تەعبیرییە Expressionism. شێوازەکەم (ئینتباعییە) Impressionism. دیمەنی شارەکەم کردووە، پەیکەری شارەکەم کردووە، کەنیسە کۆنەکەی شارەکەم کردووە، زستانی (تامپرێ) لە فینلاندە، ئینجا بەفرەکانم کردووە، بەڵام بەفرەکە، یان ئاسمانەکە، دیققەتی دەدەی، مرۆڤی تێدایە. لە هەمووی سەیرتر، بۆ برادەرانم گێڕایەوە، پێیان خۆش بوو، ئەو کەنیسە کۆنەم رەسم کردووە. دوایی بیرم کردەوە، ئەوان لە ئاسماندا مەلائیکەت دروست دەکەن، ئەمن مەلائیکەتم نەدیوە، ئەوان هەر سەرو باڵ دروست دەکەن. منیش برێ سەرم لە ئاسمانەکە دروست کرد، بە رەنگی کاڵ، بەخۆم گوت بۆ مەلائیکەت بە کوردی نەبێت. جامانی و مشکیم لەسەریان دانابوو. خەڵکەکە زۆربان پێ خۆش بوو.

- بیر و بۆچوونی رەخنەگران و بینەرانی فنلاندی، هەروەها رۆژنامە فنلەندییەکان لەبارەی پێشانگا و تابلۆکانی جەنابتان، چییان وتووەو چۆنیان هەڵسەنگاندووە؟

- بەڵێ، پێشانگەکەم بۆ ماوەی پێنج رۆژ کردەوە. داوام کرد، کە رەخنەگرێك لە رۆژنامەیەکەوە بێت. وتیان: ئێستا تەلەفۆن دەکەین. پاش سەعاتێکی دی، رەخنەگرێکی گەورە دێت، ئەوە بوو ئەو ژنە هات، کە گەورەترین رەخنەگری شێوەکارییە و شاعیریشە (ماریا کاتارینا Maila-Maria Katalina) هاتە لام و یەکسەر تۆقەی لەگەڵمدا کرد و منی ناسی، وتی: تۆ رۆماننووس بووی لە کۆنفرانسەکەدا، شتەکانی تۆم خوێندۆتەوە. وتم: چی تێدایە، فینلاندە منی کردە شێوەکار. نابێ؟ وتی: زۆر چاك دەبێ. وتم: کاتێکی زۆرم بەدەستەوە بوو، لەجیاتی باسی ئازادی و ئاوارەیی بکەم. کاتەکەم سەرف کرد، چووم لە خیلالی فێربوونی زمانی

ئینگلیزییەوە دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتێبی شێوەکاری و ئەناتۆمی Anatomy، لە خیلالی سێ مانگدا توانیم ٦٠ شەست تابلۆی ئاوی دروست بکەم، کە جێی سەرسوورمانی کوردەکان و هونەرمەندان و ئەو رەخنەگرەش بوو.

- دوا چالاکیی ئەدەبی و هونەریی (بەڕێزتان) چییە هەم لە کوردستان، هەم لە فینلاندە؟

- رۆمانێکم نووسی بەناوی رەونامە، بەڵام وەکو رۆمان بڵاو نەکرایەوە. هەرچەند سێ بەشیم بۆ بڵاوکرایەوە. ئەو کاتەی من لەوێ بووم ٥٠٪ یان کەمتر، گۆڕانم تێداکرد. ئێستا هێناومە، کە پێشکێش بە دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی دەکەم بۆ ئەوەی وەکو رۆمانێکی (بەڵگەنامە-دیکیۆمێنت) بی، تاقیکردنەوەی خۆم لە کۆچڕەوەکەدا، تەنانەت ناوی کەسایەتییەکانیش، ناوی منداڵەکانی خۆمن وەکو بەڵگەنامەی ئەو پڕۆژەیە. کە لەبەر دەستمە. پڕۆژەی دووەمم، کۆچیرۆکێکە بەناوی (لێخنبیر). من بەرگری لە کەلەپووری کوردیش دەکەم هەتا بۆ شایەدی ئەمەم نووسیومە و سەلماندوومە، کە ئیبراهیم خەلیل چییە، یان وەك وشەیەکی کوردییەو چۆن ئەوانە نازانن بیخوێننەوە. واتە بە عەرەبی و بۆ هەموو گۆڤارەکانی ئەورووپا شت دەنێرم. کتێبێکیان بۆم نارد، ئەوە باس دەکا، کە کۆنترین شارەکانی دنیا، کە هەتا ئێستا زیندوون، کەچی باسی شاری کەرکووك و هەولێری تێدا نییە. منیش بۆم نووسین، وتم: من نووسەرێکی ئاوارەم لەبەر ئەوەی ئێوە کوردی نازانن، بە عەرەبی بۆتان دەنووسم. یەکەم: راستی بکەنەوە، کە لەم شاری (ئەربەئیلۆ) و (ئاراپخا)یە، یان شاری کەروکووکە زیادکەنەوە سەر ناوی شارە دێرینەکانی دنیا. ئێوە بە هەڵەداچوونە، ئەم دوو شارە دێرینە جێی شارسانییەتی کوردستانە. ئەوەتا هەموو مێژوونووسانی رۆژئاوا دەڵێن کۆنترین دێ لە هەموو دونیادا (چەرمۆ)ی ٢٠کم نزیکی چەمچەماڵە. ئەویش ئەشکەوتی (زەرزی) و (شانەدەر) کە مرۆڤی (نیاندەرتاڵ)ی تێدابوو. کەنیسەی کاسۆلیك بە هەڵەدا چووە، دەڵێ ئیبراهیمی خەلیل لە (ئور UR) لە دایك بووە. دەڵێم ئەو وەختەی ئیبراهیم ژیاوە (ئور) لەژێر ئاو بووە. کە قورئانیش دەڵێ: لە چیای

(جوودی) کەشتییەکەی نووح وەستاوە، ئنجیلیش دەڵێ لە چیای (ئارارات) دیارە، چیای ئارارات و جوودی، هۆردووکی کوردستانە، ئینجا بێینەوە سەر وشەی (یەهوا).....تاد، ئەمەم بۆ مەرکەزی سەرەکیی مەسیحییەکانی واشنگتۆن نووسی و دانەیەکم دایە لکی (ڤاتیکان) کە نازانن مانای وشەی (یاهوا) چییە، یان وەختی خۆی چۆن خوێندراوەتەوەو لە چی هاتووە. ئەمەش دەرفەتی باش بوو، کە بتوانم بۆچوونی خۆم دەرببڕم و باس لە میدیا و مێژووی کورد بکەم. وتم: ئەو (یا)یەی (یاهوا) هی نیدائە. کورد هەتاکو ئێستاش دەڵێ (خودا یان خوا). لە فەتحی ئیسلامیدا پیتی (خ) هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، دەنا (هوا-هودا) بووە وشەکەش لەسەر یەك واتا: (یاخوا) یان (یاهوا).

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# کاروانی داهێنان ناسرەوێ و ناوەستێ و نان و داهێنانیش بەدیلی یەکتری نین




دیمانە: غازی حەسەن

رۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ژمارە ١٨٥

لە ژمارە ١٨٥ی هەفتەنامەی (ئاڵای ئازادی)ی ڕۆژی ١٩٩٥/٩/٣.

لە چەندین نووسەر پرسیاری پڕۆژەی نان و داهێنان کرا، لەوانە: کەریم شارەزا و عومەر شێخەڵڵا و مەدحەت بێخەو و سەلاح عومەر و کەسانی ترو بەندەش، ئەمەی خوارەوە وەڵامی منە:

نان و داهێنان بەدیلی یەکدی نین، جمکانەن. چۆن؟ با لە وێنەیەکەوە بچینە ناو واقیعە تاڵ و دزێوەکەو لە تۆیی جووت بەرداشەکەدا، هەڵوێست بنوێنین. ئەمێستا ڕۆحی، باڵندەیە و خێوی سیاسەت دەیەوێت باڵەکانی بقاچێ و لە فڕینی بخات. لە خوارەوەش، لەناو بێشەی دڕستانی بێ یاسادا، تووڵە و تاژی و سیخوڕی گرانی و چەوساندنەوە بیرو لێکترازانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ڕاوی دەنێن، ئەوساکە گیانم دەوێت نەبێتە نێچیر و دەرباز ببێت. ئەمەیە کرۆکی ژانی سایکۆلۆژیی نووسەری باشوور، لەپاڵ قۆڕەی گەدە و هیشکبوونی ڕیخۆڵەکانیدا، بە تووند ڕەفزی زوڕناژەنی و بوونە ئامێر و داوەڵێ دەکات. بە پێچەوانەیش، ورگویستەکان وەکو زنەکانی وشك دەکەن و تەنیا ڕەقیبی و پاسەوانییان بۆ دەمێنێتەوە. ئەوان قەڵەمیان، بە سەرقفڵانە و باربوو ناگۆڕنەوە. ئەمان، لە هەراجخانەدا هەرزانفرۆشی دەکەن، ئەوان، با برسی بن، با نازیان نەگیرێت و لە (پایە) و (سایە) و (مایە) دوور بن، وەلێ گرەوی گەل و نوێخوازی و ئایندەیان بردۆتەوە. بەلامەوە، بەم ئازارە کاتییە، داهێنانەکە هەژاوترو ڕەسەنترو جوانتر دەکات. ناشمەوێت بڵێم: نووسەر پێغەمبەرە، بەڵکو بژێوی (الحد الأدنی)ی گەرەکە و نان پێش داهێنانە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە ژیانی دژوار بوو، ئیتر پشت لە ڕۆحی داهێنان و ئەفراندن بکات. بوێرو دڵسۆز و ڕاستگۆ هەرگیز سەرچاوەکەی وشك نابێت، ئەگەر لە ئاست پڕۆژەی نان و داهێناندا هەڵوێستی دیواربڕی هەبوو. نان و داهێنان، دوو خۆراکی لەش و گیانن، ئەگەرچی لە دۆخی

ناڵەباری ئەمڕۆدا، یەکێکیان تەنگ بەوەی دی هەڵدەچنێت. لەم دوو ڕێیانەدا هەڵوێستی خاوەن قەڵەم، هاوکێشەکە رادەگرێت و هەر خۆی بەرپرسیارە لە لاسەنگیی سك و هەڵوێستدا. ڕاستە، نانەکە لە چنگ و گەرووی ئەژدیهای حەوتسەری دەسەڵات و حزباندایە، بەڵام خۆ گوومرگی لەسەر نییە، ئەگەر بڵێم: بۆ سیاسەتمەداران چرکەیەك گوێ لە ئێمەمانان ناگرن، یان لاپەڕەی گڕکانی تەقیو ناخوێننەوە؟ کێشەکان لەوەدایە، ئەوان سەرجەمی ڕۆشنفکران بە پاشکۆی سیاسەت دەزانن. دەبوایە پڕۆژەی (التفرغ)یان لە پەرلەمان و حکوومەتەوە ئەنجام بدایە، مخابن، هیچی تر ناڵێم و حەواڵەی دادگەی ئیستێتیکا و مێژوویان دەکەم. دڵنیاشم لەوەی، کە کاروانی داهێنان ناسرەوێ سەرەڕای سك گوشین و ئازاری دەروون.

**عەبدوڵڵا سەڕاج:**

# نووسەر گرێدراوی ئامێری سیاسەت نییە



**دیمانە: سەرفراز نەقشبەندی**

**ڕۆژنامەی وڵات، ژمارە ١٤٨**

- له ئاستی ئەو قارەمانیەتییە و کارەساتە تراژیدیا بەردەوامانەی له کوردستاندا روو دەدەن، کتێبخانەی کوردی شاکاری ئەدەبی وای تێدا نییە، که دەربڕی ئەم بۆیەره بێت؟

- بۆ ئەوەی دەلاقەیەك بۆ چوونه ناو (بۆیەره) تاڵەکەی رەوشی رۆشنبیریمان بکەمەوه، پێشەکی پەنجەی تاوانبارکردن له دورِ چاوی دۆگمایی و تەسك بینی ئەو حیزبانەی باشوور دەکەم، که بۆ بەرژەوەندی تاکی و دەستکەوتی لایەنیان، تاکتیك و ستراتیژیان سەربڕیوه. تەنانەت بیرێك له فیدراسۆنێك، یان کۆنگرەیەکی نەتەوەیی بالاّ ناکەنەوه، کەوا گەلەکەمانی پێ یەك دەنگ بێ، چ رووبەڕووی دەولّەتانی دراوسێ و چ له دەرەوەی ولاّت بۆ لەباوەشگرتنی ئەو گشت پالّپشتی و هاوسۆزی و دۆستایەتییەی، که بەرهەمی کیمیابارانی هەلّەبجه و بالیسان و..... رەشەکوژی و ئەنفال و راپەڕین و رەوه ملیۆنییەکەمان بوو، خۆ ئەگەر بشێ و بلّێم: پەرلەمان و حکوومەتی هەرێمیش بەرهەمی ئەو کارەساته تراژیدیانەن، که له پرسیارەکەدا ئاماژەی بۆ کراوه، بگره پێنووس و پەڕەمووچەکانمان قەرداری ئەو کارەساتانەن، که دیاره کورد و بەتایبەتی سەرانمان به هیچ کلۆجێك پەند له مێژووی دێرین و نوێمان وەرناگرن، بەلّکو دەست دەخەنه ناودەستی ئەوانەی هەرگیز ناخوازن کورد یەکپارچه بێ و خاوەنی پەرلەمان و حکوومەت و چارەنووسی خۆی بێ، بەتایبەتیش خودی سەرکردەی جووت هێز، کتێب و نووسراویان هەیه، لەو بارەوه (لەسەر کاغەز) دۆست و دوژمنانیان پەنجه نیشان کردووه، کەچی له (پراکتیکدا) هەمان هەلّه مێژووییەکان پەیڕەو دەکەنەوه. وا لەبەرچاوه، هیچ کامیان، لەبەر بەرژەوەندیی بالاّی نیشتمانی، له کەلی شەیتان نایەنه خوار، له کاتێکدا، (تەنازول) بۆ داگیرکەران دەکەن و بازرگانی به چارەنووسمانەوه دەکەن.

راستە نووسەر، راستەوخۆ گرێدراوی ئامێری سیاسەت نییە، بەڵام هەرگیز بێ لایەنیش نییە و دەستەوەستان ناوەستێ، بگرە هەڵوێستی بوێرانەی هەیە و دڵسۆزانە تۆماری دەکات وەك شایەتێکی راستگۆی سەردەمەکەی. هەڵبەتە، مەبەستم لەو کەسانە نییە، دۆخی نالەباری ئابووری ، یان هەر خۆیان-لە بێخەوە- حەز دەکەن ببنە (واشەر) و (دشلی) و جەڕی ئامێری شەڕە دەنووکی حیزبایەتی، بەمەیش هەرچی (سادی)یەت لە گیانیاندا پەنگی خواردۆتەوە، دەیڕێژن.

دەگەڕێمەوە سەر مەبەستی سەرەکی. دیارە مەرج نییە پاش هەر رووداوێکی جەرگبڕ و دڵتەزێن، زوو بە زوو ببێتە هەوێنی شاکارێکی مەزن، چونکە هونەر و ئەفراندن و ئێستێتیکا هەیە و بە تەنیا تۆمارکردنی زەقی رووداو نییە. ئەمەیان لەلایەك، لەولای دیکەوە، کێ دەڵێ: بەرهەمی پوخت و شاکار لە دایك نەبووەو ئەمێستا لەلای نووسەران و هونەرمەندان، گەردو گوومێشی لێ نەنیشتووە. خۆ لە رەوتی پێنج راپەڕینەوە هەتاکو هەنووکە، چ بایەخێك بە جەستەی رۆشنبیری دراوە؟ کامەتا ئەو بودجانەی بۆ رۆمان و شانۆنامە و هونەرەکانی تر تەرخان کرابێت؟ ئەگەر هاتبا، ساڵی یەك کۆچیرۆك و یەك رۆمان و یەك کۆشیعر و یەك شانۆنامە.....تاد، چاپ بکرابایە، ئێستاکە کتێبخانەیەکی ختجیلانەی راپەڕین و حکوومەتی هەرێمی کوردستانمان دەبوو، کە نەوەکانمان شانازییان پێوە بکەن. مخابن. وەلێ ئەگەر ئاماژە بۆ کەڵەکەی فیشەك و گوللە تۆپی R. B. G و هاوەن و دۆشکە و رۆکێت بکەین، ئەوا تووشی سەرەگێژی دەبین. خۆزگە بۆ چاندو کولتوور و بنیاتنانەوەی ژێرخانی ئابووریی کۆمەڵ دەکرا. دەشێ بڵێم: خودی حیزبەکان هۆیەکن لە هۆیەکانی بە ئەنفالکردنی رۆشنبیریمان و نووسەرانیان بە (ئیزدواجییەت) گەیاندووە، بە دەیان گرووپ و دەستە و کۆمەڵەی کاتی و سەقەت دروست دەکەن و (تەنیا سوودی بۆ کەسانێك هەیە و بەس، کە پارەیان نەما، هەڵدەکوتنە سەر (لووتکەی هەرەمەکە) و هەمدیسان. بە نزا و پاڕانەوەو ملکەچی، برێ پارەو پوول وەچنگ دێنن و سووڕی مشەخۆرییەکەوە دەکەوێتە خولانەوە. ئەمە، دیمەنێکی کاریکاتێرانەی بارەکەیە. ئەگەر رەخنەت لێ گرتن، ئەوا گشت ناتەواوی و سەقەتییەکە دەهاونە ئەستۆی دۆخی سیاسی و گەمارۆی ئابووری و شتگەلی لاوەکی و نازانم

چی. بەرانبەر بەمەیش، بازاڕ پڕە لە قوتووی بیرەو پیپسی و سێڤن ئاپ و هێشووی مۆزو نەستەلەی جۆراوجۆر، کەوا لەکاتی ئاساییدا وا بەو زۆرییە نەبوون. ئەمانە خۆراکی کێن؟ بۆ پارە بۆ کەمالیات و چەکەمەنی و زەلام کڕین و ترومبێلی دوا مۆدیل هەیە و پارە نییە بۆ لە چاپدانی شاکارێك، کە گوزارشت لەم سەردەمە جەنجاڵەمان بکات؟

بەرگوێم کەوتووە، کە چەندین بەرهەمی چاك لای نووسەران هەیە و کەس بە دەنگیانەوە ناچێ، لە خولگەی هەر سەرۆك حیزبێکدا شانەیەکی مافیا هەیە و بۆتە بەربەست لە رووی موبدیعە راستەقینەکان، ئەمانە دەیانەوێ-وەکو خۆیان- نووسەران رۆبۆتی Robot سیاسی بن، لەیستۆکی دژوێنفرۆشتن بن، دەڵاڵ بن و بانگەشە بۆ کەرەستەی پوواو بکەن. بەخۆم، سەردانی چەندین دەزگای رۆژنامەم کردووە، بەڵکو هەر نەبێ بە زنجیرە، شاکارێك لەمەڕ ئەو کارەساتانەوە بڵاو بکەمەوە، بەبێ قرتاندن و سانسۆر.. مایە پووچ بووم. هەر ئەم ئەزەوونەم لەگەڵ هەفتەنامەی (وڵات)یشدا هەیە، بە روو ساردی گەڕامەوە. کەچی ئەوا، نوێنەریان داوای شاکار دەکات. لەوانەشە، نووسەران و هونەرمەندان بە کەمتەرخەم و بێ هەڵوێست بزانن. رووی دەمم دەکەمە گشت دڵسۆزانی کوردستان: ئێوە دەزگایەکی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە دامەزرێنن، ئەوسا بۆتان هەیە نووسەران بخەنە ناو قەفەزی بەرپرسیارییەوە. ئەز، گەشبینم و رۆژێك دێ، دەنگی نووسەران بژنەون و حەقیقەتە رووتەکان بە چاوی خۆتان ببینن. هیوادارم، بێ زیاد و کەم بگاتە خوێنەران و بە دەردی ئەو رۆژنامەنووسە نەبێ، کە ویستی دیدارم لەگەڵدا سازدات لەمەڕ هەڵەبجە و ئەنفالەوە، گوتم: (چاکە، بە مەرجێك ئەوەی دەیڵێم بڵاوی بکەرەوە)، گوتی: (بۆ تۆ بە تەمای بڵێیت چی)؟! گوتم: (خۆمان باریدەدەر و هۆکاری ئەو تراژیدیایەن) متەقی نەکردو وازی لە کارەکەی هێنا لە دڵمەوە گوتم: (حەوت پشقلەت بە دواوە) هەن دەنگی راستگۆ بە نەشاز دەبیستن چ جای ئەوەی پارە بدەن بۆ جاڕدانی دەنگی زوڵاڵ و بەدەستی خۆیان، ئاو راکێشنە ژێر رایەخەکانیان. بە سەربەستی، ئەوە بوو دیدی من لە ئاست بڵاونەبوونەوەی شاکارێك، کە هاوتەریبی ئەو کارەساتانە بێت.

**عەبدوڵڵا سەڕاج:**

# شاعیری نوێخواز سەباح ڕەنجدەر پێشنیازی ناونیشانی کاولاشی بۆ ڕۆمانەکەم کرد و ناونیشانێکی گونجاویشە



**دیانە: سەباح ئیسماعیل**

**ڕۆژنامەی باسەڕە، ژمارە ٩٩**

چۆن نەتەوە سامانی کەلەپووری هەیە و شانازیی پێدەکات، ئاوهاش مرۆڤی سامانی رۆشنبیری هەیە، بە هەمان شێوە شانازیی پێوە دەکات لەناو نەتەوەکانی دیکەدا. کەس نییە لە رەخنەگران و ئەدەب دۆستانی کورد، تەنانەت هی عەرەبیش چیرۆکنووس و رۆماننووس (عەبدوڵڵا سەڕاج) نەناسێت. ئەوەی ئەم ناوە بە گوێچکەیدا بێت، بێگومان رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە) و (کاولاش)ی بەیاد دێتەوە، بەڵام بۆ ماوەی هەشت ساڵ دەبێت ئەم ئەدیبە فلیڤانە، بە جەستە لە هەندەرانە، بەڵام بە هزر و کارو هۆش و رۆح لە کوردستانە.

هەرچەندە بە تەمەن بووە، بەڵام یادگاری و زانیارییەکانی لە مێشکدا چەقیون و بەڕەونەقی جارانی ماون، لە سەردانێکی بۆ نیشتمان، بە دیداری شاد بووین و توانیمان لە نزیکەوە ئەم چەند پرسیارەی ئاڕاستە بکەین بە سوپاسەوە:

- تۆ یەکێکی لەو نووسەرانەی بە چیرۆك دەستت پێکردو چیرۆکیشت زۆر نووسیوە، بەڵام بۆچی ئێستا چیرۆك نانووسیت و رووت کردۆتە رۆمان، لە کاتێکدا تەکنەلۆژیا ئەوە دەخوازێ شتەکان کورتتر بێتەوەو ماوەیەکی کەمتر بخایەنێت. رەنگە بازاڕی رۆمان ساردتر بێت لە بازاڕی چیرۆك، تۆ بۆچی یەکجاری وازت لە چیرۆك نووسین هێنا؟

- وازم لە چیرۆك نووسین نەهێناوە. نووسەر دەبێت ئەزموون بکات وەکو شێوەکاران، تاکو بزانێت خۆی لە کوێ دەدۆزێتەوە. نزیکەی چل-پەنجا چیرۆکی زۆر زۆر کورتم نووسیوە. ئێستا ئەوانەی ئێمە دەینووسین (بەقەدەر لەپی دەستە) جۆرێکی تایبەتە. هەر یەکە لە ئێمە سنووری (شێوازی) هونەریی خۆی هەیە. پاش پێنج کۆچیرۆکی کورت دەتوانم بڵێم: دوو تا سێ کۆچیرۆکی دیکەم لەملاو ئەولا بڵاوکردۆتەوە کە نەخراونەتە توێی کتێبەوە. ئەمە سامانێکی زۆرە. لە ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٤دا دەستم دایە (هەڵکشان بەرەو لووتکە) وەك تاقیکردنەوەیەکی نوێ.

لە ساڵی ١٩٨٤ دامە دەزگای بڵاوکردنەوە لە بەغدا، بەڵام هۆکارێك بووە تەگەرە بۆ پێشخستنی ڕۆمانی (شار)ی حوسێن عارف، ئەوەبوو لە ١٩٨٩ بڵاویان کردەوە. بۆ ئەوەی نەڵێن ڕۆمانەکەی من پێشەنگە و ئەوی حوسێن عارفیان پێشخست.

بەهەر حاڵ کە نووسەر ڕۆمانی کوردی دەنووسێت، هەست دەکات ژیانێکی بەربڵاو و مەودایەکی زۆری هەیە، وەکو سوارێکە بیەوێ ڕمبازی لە پانتاییەکی فراوانی سروشتیدا بکات. سەبارەت بە چیرۆکی ئەمڕۆ واهەست دەکەم ڕمبازییە لەناو ژوورێکدا. ئینجا بەلای منەوە ئەوەی ڕۆمان بنووسێت، زۆر زەحمەتە بتوانێت چیرۆك بنووسێت، هەرچەندە میتارۆمانی ئەمڕۆ، خۆی لە خۆیدا، چیرۆك لەناو چیرۆکە، ئەوەش یەکێکە لە سیمای ڕۆمانی نوێی ئەمڕۆمان. من تا ئێستاش خۆم بە ئەزموونکار دەزانم.

- یەکێك لەو ڕەخنانەی لە (هەڵکشان بەرەو لووتکە) گیرا، گوایە ڕۆماننووس چیرۆکەکانی لێکداوەو مۆنتاژێکی کردووەو ڕۆمانێکی پێ دروست کردووە، شتێکی نوێی نەگوتووە، تەنانەت هەمان ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکانی گواستۆتەوە ناو ڕۆمانەکە؟

- تاڕادەیەك وایە، بەڵام بەو بۆچوونە نییە. من ئەو چیرۆکانەی بڵاوم کردوونەتەوە، لە بنەڕەتدا وەکو ڕۆمان نووسیومن و خستوومەتە ناو ڕۆمانەکەوە، چونکە ئەو وەختە مۆڵەتی چاپی نەبووە، بەڵام ئەو بەشە ڕۆمانە دەتوانم ناوی بنێم کورتە چیرۆك و لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوی بکەمەوە، هەرچەندە ڕۆمانی نوێ-هەروەکو باسم کرد- خۆی چیرۆك لەناو چیرۆکە، ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتەکانی، بۆیە ئەوە ناچێتە ناو قاوغی ڕەخنەی هونەرییەوە، تەنانەت دواترین ڕۆمانم بەم جۆرە نووسیوەتەوە، ئەمە یەکێکە لە هونەری میتارۆمان. لەوانەیە لە (هەڵکشان بەرەو لووتکە)دا کە (٣١٠) لاپەڕەیە، دوو سێ چیرۆکی لێکدراوە، کە هەمووی ناکاتە (٢٠) لاپەڕەیەك، ئەی ئەوەکەی دیکەی چییە. ئایا کارێکی نوێ نییە و پتر لە ١٠-١٢ نووسەر لەبارەیانەوە نووسی.

- له چیرۆکەکانتدا، پاڵەوانەکانت کەسانی رۆشنبیر و شارین، بەڵام له دووهەمین رۆمانت (کاولاش) گەڕاویتەتەوە سەردەمی دەرەبەگایەتی، واتا: زیاتر لادێت بەرجەستە کردووە نەك شار؟

- له بنەڕەتدا رۆمان هونەرێکی شارییە. هەتا شارەکە گەورەتر بێت، ماوە دەدات رۆمان دروست بێت. کورد بۆ رۆمانی نەبوو؟ چونکە شارستانێتیی بەهێزی نەبوو، جارێکیان له میهرەجانی (میربەد)ی هەشتەمدا، ئەوکات رۆمان نەنووسرابوو، (مەحموود زامدار)ی نووسەر پرسیاری لێم کرد: پاش تاقیکردنەوەیەکی زۆری چیرۆك نووسین، تۆ هەڵبژێردراوی بۆ رۆماننووسین. شارەکەشت هی ئەوەیە رۆمانی تێدا بنووسی، چونکە ململانێی نەتەوەیی تێدایە، ململانێی کۆمپانیای نەوتی تێدایە. ئەوە جێی رۆمانە. گوتم: مژدەت بدەمێ، ئێمە ئێستا له هەشتاکانین و لێم دەپرسیت، بەڵام من له ١٩٧٩ رۆمانم نووسیوە وەلێ چاوەڕوانی چاپە.

وەکو گوتمان رۆمان دەرهاوێژێکی شارستانی و ژیارییە، بەڵام من له رۆمانی (کاولاش)دا -که ناوەکەی له پێشنیازی شاعیری نوێخواز (سەباح رەنجدەر)ە، چونکە وڵاتەکەمان ئاشە کاولێکە، ناونیشانێکی گونجاویشە. من لەوێدا تەحەددام کردووە. گوتم: ئەی بۆ رۆمان له دێیەك نەنووسرێ که (چیمەن)ە، چەند جار شەهید کراوە، سی ماڵن، من تەحەددا دەکەم و له دێیەکی سی ماڵیدا رۆمان دەڕسکێنم ئەوەش بۆمن تاقیکردنەوەیەك بوو، دوا رۆمانیشم (ونگە) له فنلاند نووسیم و له بەرلین دەزگای (هاڤیبوون) چاپی کرد، لەوێدا بە کولتووری کوردی، بە ئەفسانەی کوردی چوومەتە ناو شارستانێتی ئەورووپاوە، ئەمەش تەحەددایەکی دیکە بوو.

- عەبدوڵڵا سەڕاجم ناسیبێت هەردەم گەنج بووەو هەردەم ئارەزووی شتی جوانی کردووە. له ئەدەبەکەشیدا هەردەم له نوێکردنەوەدا بووە، بەڵام ئایا دوای تێپەڕبوونی تەمەنی، چۆن خۆت دەبینیتەوە؟

- من، خۆم هەر بە گەنج و لاو دەزانم، دواترین کوڕم که ئێستا دکتۆرە له هەولێر، پێیدەڵێم: تۆ گەنج قەدیمیت. هەشت ساڵە له ئەورووپا دەژیم، هەر عەیبە بڵێم پیر بووم،

چیرۆکنووسێکی برادەرم هەیە لە فنلاندا، ژنە و بە حیساب سالێکیش لەمن گەورەترە، گوتم: من پیرم. گوتی: بلێ بە تەمەنم و هەر عەیبە، لە حەفتا بەولاوە بە خەلك دەوترێ پیر، بەلام قەلەم و ئیبداع قەت پیر نابن، کە پیر بوو، واتا: وەستا و هیچی پێ نەما. گەنج هەیە وەستاوەو هیچی پێ نەماوە، پیر بووە با تەمەنی بیست سال بێت. ئەفراندن زەمەن و تەمەنی دیاریکراوی نییە.

- چۆن دەڕوانیتە چیرۆکی کوردیی ئەمڕۆ، ئایا لە پێشکەوتندایە، یان لە قەتیسماوی، یان بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە؟

- سەردەمی ئێمە-حەفتاکان- بەردەوامین هەتاکو دوو هەزاریش، چەند جیلێکی دوای ئێمە هەیە، بەلام بەگوێرەی ئەوەی من ئاگادارم، سەرەڕای ئەوەش کە لە هەندەرانم و بەشێوەیەکی کەم ئاگادارم، ئەو جیلە گەنجە نەیتوانیوە ئێمە تێپەڕێنێ، چونکە هێشتا دەنگە ڕەسەنەکان هەر بەردەوامن. لە دیداری یەکەمی چیرۆکی کوردی سالی ١٩٧٩و لە دیداری دووەمی چیرۆکی کوردی بەشداریم بە دوو چیرۆك کرد (برایم شۆراوی) و (٨.٣٠ بەیانی و ٨.٣٠ شەو) هەردووکیان جێی سەرنجی ڕەخنەگران و ستایشی خەلکەکە بوون. دەیان چیرۆکی وام نووسیوە کە جیلی گەنجی ئێستا نەیتوانیوە ئەو ئاستە هونەری ئێستێتیکایە تێپەڕێنن، بەلام کە دیداری یەکەمی چیرۆکی عەرەبی عێراقی لە هەولێر کرا. یەکێك بووم لە بانگهێشتکراوەکان، شاعیری نوێخوازی عەرەب (عەدنان ئەلسائیغ) دیدارێکی لەگەلم سازدا بۆ گۆڤاری (حوراسولوەتەن) لێمی پرسی تۆ عەبدوللا سەڕاجی چیرۆکنووسیت-ئەوسا بە چیرۆکنووس دەناسرام- پاش جیلی تۆ، کێ پەسند دەکەی، هەلگری ئالاکە بێت؟ وەکو (محەمەد مەولوود-مەم) لە هەشتاکاندا پێمی گوت، کاتێ قسەم لەگەلی دەکرد، ئەوسا نەمدەناسی. بە دەوری قەلای هەولێردا سووڕاینەوە، گوتی: من زۆر خۆشحالم کە چیرۆکی تۆ دەخوێنمەوە وادەزانم من نەمردوومە، چونکە تۆ هەلگری ئالاکەمی. ئەمەی لە یادگارییەکانیدا نووسیوە. بەهەر حال وەلامی پرسیارەکەم دایەوەو گوتم: پرسیارەکەت زۆر جوانە. من چوار کەسم دەستنیشان کرد، ئێستاش هەر ئەو چوار

کەسە داهێنەرن کە ئەو کاتە نەناسرابوون. ئەو چوار کەسەش ئەمانەن: شێرزاد حەسەن، سەلاح عومەر، غەفوور سالح عەبدوڵڵا، جەلیل کاکەوەیس بە کورتی دەتوانم باسی نەخشەی ئیبداعی ئەدەبی بکەم، شاری سلێمانی بەگشتی شاری هونەر و شانۆیە، هەولێر شاری کولتوور و شیعر و فۆلکلۆر، بەڵام شاری کەرکووك، شاری چیرۆك و پەخشان و رەخنەو رۆمانە. جوانترین ئیبداع لە قەڵەمی کەرکووکییەکانەوە دەردەچێت هەرچەندە لە دوای شارەکانی دیکەن. ئێستاش شانازی بەو چوار چیرۆکنووسەوە دەکەم، ئەوانە جیلی دوای ئێمەن، بەڵام بڕوام بەوە نییە کە جیل دابەش بکرێتە سەر دە ساڵ دە ساڵ. شێخ مارفی بەرزنجی بە پێشڕەوی چیرۆکی هونەریی کوردی دەزانم. گەنجی واش هەیە تەمەنی (٢٥) ساڵە، لە ئەدەبەکەیدا و لە هۆش و هزرەکەیدا زۆر پیرانەیە. لەبەر ئەمە جیل هیچ واتایەکی نییە لە رەخنەدا.

- نووسەرێکی هەندەرانی عەرەبی عێراقی دەڵێت: (لیس هناك حنینٌ الی الوگن بل هناك حنین الی الڏکریات) تۆ ئەمە بەڕاست دەزانیت؟

- بەلامەوە هەردووکی یەك شتە، چونکە یادگارییەکە نیشتمانە. هەرچەندە لە ئاوارەییدا دەژیم، بەڵام هەرگیز هەست بە ئاوارەیی و غوربەت ناکەم، چونکە نیشتمان لە رۆحمدا دەژێت و هەمیشە بۆ نیشتمان دەژیم، لە پرسیارێکدا بۆ تەلەفزیۆن لێیان پرسیم: هەست بە غوربەت دەکەیت؟ وتم: نەخێر. ئەی کات چۆن بەسەر دەبەیت؟ وتمەوە: کاتەکەم زۆر کەمە، خۆزگە شەو و رۆژ (٥٠) سەعات بوایە، چونکە بەشم ناکات بۆ خوێندنەوەو نووسینم، بۆ نیگارکێشان و نمایشکردنی کەڤاڵەکانم. مرۆڤ ئەگەر ئیبداع بکات، نامۆیی و غوربەت دەتارێنێت.

- سەبارەت بە پڕۆژەی نوێ چیت بەدەستەوەیە؟

- ئیش و کارم لە فنلاندا دوو بەشە، بەشێکیان رۆمان نووسین و نووسین بە گشتی لەبارەی هونەری رۆمان و ئەفسانە و دەینێرم بۆ گۆڤارە کوردییەکان و هەندێ جاریش وانە دەڵێمەوە. بەشی دووەمیش: بەهۆی درێژیی شەوانی زستان، دەستم کردە خوێندنەوەی هونەری شێوەکاری بە ئینگلیزی و پاشان وێنەم کێشا، تاکو ئێستا

نزیکەی ٦٠-٧٠ تابلۆم بەڕەنگی ئاوی کێشاوە. چوار پێشانگەم کردۆتەوە، چەندین ڕۆژنامە لەبارەیان نووسیوم وەکو ڕۆژنامەی: هێلسنکی سانومات، ئامولێهتی، هێرڤانتنا سانومات و.....تاد، ئەوانە جارو دووان لەبارەیان نووسیوم چ لەبارەی ڕۆمانەکانم و چ لەو کۆنفرانسە ئەدەبییەی، کە بەشداریم تێدا کرد لە شاری (لاهتی) ساڵی ١٩٩٧ لە تەك شێرزاد حەسەندا. هەروەها بەشداریی گۆڤارە کوردییەکانی ئەمەریکا، لەندەن و سوێد و نەرویج دەکەم بەبێ گوێدانە ڕەوتی سیاسییان. لە ساڵی (١٩٩٩) ڕۆمانێکم لە دەزگای (موکریان) بوو، بەڵام دواتر ڕەوانەی دەزگای (ئاراس) کراو پاش (٥) ساڵ چاپ کرا. نەشمزانیبوو چاپ کراوە. بۆیە پێنج پارم بۆ زیاد کردو بەناوی (ئەژدەر) لە گیرفانی خۆم چاپم کرد. دوو ڕۆمانی دیکەم (سۆناتای ڕۆح) و (ونگە) کە بە ژمارەی کەم لە هەولێر و بەرلین چاپ کرابوون، دووبارە لە گیرفانی خۆم چاپم کردنەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٣دا بەشداریم لە کۆنفرانسی کەرکووك کرد لە تەك دکتۆر نووری تاڵەبانی و دکتۆر جەبار قادر و کاك عەلی مەحموود سەعید و دەیانی دیکە. کتێبێکی تیۆریشم لەژێر ناوی (بەرەو ئاستانەی چیرۆکی نوێ و گۆشەنیگاکانم) ناردۆتە سلێمانی بۆ دەزگای (سەردەم) مخابن لەوێ عەوقی خواردووە. ڕۆمانێکم لەژێر ناوی (ئاراپخاو.. خەمەکانی تریش)-پاشان ناوەکەیم کردە (پەرتەوازەی ئێرەو ئەوێکانی ڕەوان)- ساڵی داهاتوو چاپی دەکەم.

ئەم هاتنەوەیشم بۆ ئەوەیە کە لە ناوەندی مانگی پێنجەمدا پێشانگەیەك لە هەولێر بۆ کەڤاڵەکانم دەکەمەوە بەناوی (ڕەنگیش دەدوێ) لە (٤٢) کەڤاڵ پێکهاتووەو بە هیوام پێشانگەکە بهێنمە (کەرکووك)ی زێدم، ئەگەر دەرفەتیش بوو لە سلێمانی نمایشیان دەکەم.

- جەنابت یەکێکی لەوانەی، کە سەرەتای نووسینەکانت زیاتر لەسەر ڕەنگ و شێوەکاری بوون لە ئەدەبداو لەبیرمە شتێکت لەبارەی ڕەنگ نووسیبوو لە شیعری نالیدا؟

- راستە من چەند وتارێکم لەبارەی نالی نووسیوە، لایەنی شێوەکاری لەلای نالیدا، ئەوانە بڵاوکراونەتەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٣-١٩٧٤دا بە زنجیرە لەبارەی هونەر بەگشتی و شێوەکاری بەتایبەتی (٣١) وتارم لە (هاوکاری)دا هەیە کە بەڕای شێوەکاران: محەمەد عارف، ئازاد شەوقی و ئیسماعیل خەیات و نووسەر سەباحی غالیب و رەخنەگر کەمال غەمبار و .....تاد، دەڵێن: کەس پێش تۆ لەبارەی شێوەکاریی نەنووسیوە، تەنانەت لە چیرۆك و رۆمانەکانمدا بە رەنگ و هێڵ دەنووسم، لە تابلۆکانیشمدا هزرم دەردەبڕم. واتا: جیاوازیم نییە لە نێوان: نووسین بە وشەو وێنەکێشان بەڕەنگ و هێڵ.

- لەوانەیە ئەو سەرکەوتنەی کە لە چیرۆکەکانت بەدیت هێناوە، لە رۆمانەکانتدا بەدیت نەهێنابێت، بۆیە تا ئێستاش بە چیرۆکنووس ناسراوی؟

- ئەمە بۆچوونێکی زانستییانە نییە، چونکە بە رای رەخنەگران من میتا رۆمانی (کاولاش)م نووسیوە، کە کەس نەینووسیوە، دوای چەند ساڵێك (عەتا نەهایی) لە کوردستانی رۆژهەڵاتی ئێران لەو جۆرەی نووسیوە. (هەڵکشان بەرەو لووتکە) بە رای رەخنەگران و بە رای (حەمە سەعید حەسەن)یش کە بەراوردی کردووە لەگەڵ رۆمانی (ئاخر الملائکە)ی (فازل عەزاوی)دا، بە شاکاری ئەدەبی ناساندوویەتی. (دکتۆر ئەحمەدی مەلاش گۆڕیویەتە سەر زمانی فەڕەنسی)، برادەران دەڵێن کە تۆ (کاولاش)ت نووسیوە. بەسە، بێجگە لەوانەش (ونگە) و (سۆناتای رۆح) و (پەرتەوازەی ئێرەو ئەوێکانی رەوان) بە رای زۆرینەوە لووتکەی ئەدەبی کوردین. دکتۆر فەرهاد پیرباڵ لە گەڕانەوەیدا بۆ کوردستان، ئەوسا یەکدیمان نەدەناسی. لە دیمانەیەکیدا لە (کوردستانی نوێ) گوتوویەتی: (سێ چیرۆکنووسی موبدیع ئیزافەیان کردۆتە سەر خەرمانی چیرۆکی کوردی، ئەوانیش: محەمەد ئۆزۆن، عەبدوڵڵا سەڕاج و محەمەد موکرییە. ئەڵبەتە ئەو دەکیۆمێنتە لە کوردستانی نوێدا تۆمارە.

- هەست ناکەیت ژیان زۆر بێتام بووە؟

- نەخێر، ژیان زۆر خۆشە، ئەگەر بێتامیش بێت ئەوا خۆمان بێتامان کردووە. ئەگەر ژیان بێتام بوو دەبێ مرۆڤ خۆی بکوژێت، خۆکوشتنیش تاوانە بەرانبەر کەسێتیی خۆت دەینوێنێت ئیبداعیش لە ناخۆشیدا، لە ناهەمواریدا دروست دەبێت.

- دوا وتەتان؟

- بۆچوونێکم هەیە، مرۆڤ کاتێك پێی دەگوترێ چیرۆکنووس، کە بەلایەنی کەمەوە سێ کۆچیرۆکی هەبێت. هەروەها بە کەسێك دەگوترێ رۆماننووس کە سێ رۆمانی هەبێت، بەڵام ئەگەر هاتوو ژمارەی رۆماننەکانی زیاتر بوو لە کۆچیرۆکەکانی. وەکو من، کە پێنج کۆچیرۆك و هەشت رۆمانم نووسیوە، کەواتا خۆم بە رۆمانووس دەزانم نەك چیرۆکنووس. ئەمەش مانای راکردن نییە، بەڵام دەستووری کارەکە وایە. ئێمە دەبێ زاراوەکان بە تەواوی دانێین. ئەگەرنا، چۆن جیاوازی لەنێوان چیرۆکی کورت و نۆڤلێت دەکەین و.....تاد، ئەوانە قەبارەی هونەریی خۆیان هەیە و جیان لە یەکتری.

**عەبدوڵڵا سەڕاج:**

# بە ویستی هیچ کەس و دەسەڵاتێك نانووسم، ئەوە دەنووسم، کە خۆم دەمەوێت



**دیمانە: مەسعوود پەرێشان**

**ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە ٢١١٠**

ئەگەرچی بە بنەچە عەبدوڵڵا سەڕاج خەڵکی سلێمانییە و بابانیشە، بەڵام وەکو ڕۆشنبیرێکی کەرکووکی ناسراوەو ڕەنگە خۆشی هەر وای پێ خۆشتر بێ، چونکە چاوی لە کەرکووك کردۆتەوەو لەو شارە دێرینەی کوردستانیشدا خەڵکەکەی لەجیاتی عەشیرەت، زیاتر بە پیشەکانیان دەناسرێن، ئەویش کە باوك و باپیرانی پیشەی سەڕاجییان کردووە، بەو جۆرە خۆی ناساندووە.

سەرەتا وەکو چیرۆکنووسێك ناسرا و دواتریش کەوتە کەڵکەڵەی ڕۆماننووسین و توانی لەم بوارەشدا چاکتر خۆی بناسێنێ و ببێتە یەکێك لەو ڕۆماننووسە کوردانەی، کە لە باسی ئەم بوارەدا هەمیشە ناوی لە ریزی پێشەوە بێت. ژیانی ئەم نووسەرە بە توانایەمان سەراوە دەراوی زۆری تێ کەوتووە، بەوەی هەمیشە لەبەرەی گەلەکەی خۆیدا بووەو پێشمەرگایەتی کردووەو تاراوگەی تاڵی بینیوەو لەم پێناوەشدا برسییەتی و تینوویەتییەکی زۆریشی بە نسیب بووە، سەرباری کۆمەڵێ قۆناغی ژیان، کە هەر هەموویان بەسەریەکەوە تراژیدیایەکی کوردانەیان بۆی دروست کردووە، کە دەمەوێ لەم دیمانەیەدا هەموویانتان بۆ خورد بکەمەوە. بۆ ئەم مەبەستەش کاتێکی دیاریکراومان دانا.دوای پشوودانێك و خواردنەوەی قاوەیەکی تاڵ، لە یەکەمین پرسیارمدا گوتم:

- تۆ ئەمڕۆ تەمەنێکی باشت تێپەڕاندووەو لە تەمەن و بەرهەمیش گەیشتوویەتییە ئاستی پیری، بەڵام لە دیمانەکانتدا من هەروەکو گەنجێکی یاخی دەتخوێنمەوە؟

لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، تەمەنم لە سەرووی حەفتا ساڵییەوەیە، بەڵام هەر یاخیم و هەر ئەزموونگەرم، چونکە ئەگەر مرۆڤ لە ئەزموون بکەوێ، لە داهێنانیش دەکەوێ، بۆیە هەمیشە لە هەموو بارودۆخێکی نالەبار یاخی دەبم، تا ئەو ئاستەی زۆرجار لە دەروونی خۆشم یاخی دەبم، چونکە هەر مرۆڤی یاخی دەتوانێ شتی تازە پێشکێش بکات دژ بە کارە دەمامکدارە نارەسەنەکان.

- به پرسیارێکی دیکه هێنامه قۆناغی شۆڕشگێڕی و پێشمەرگایەتی و دژایەتیکردنی خۆفرۆشەکان و رووبەڕوو وەستانەوەی رژێمە بۆگەنە یەك بە دوای یەکەکانی ئێراق و کاردانەوەیان لەسەر سەرجەم ئەدەبیاتەکانی؟

لە وەڵامدا گوتی: ئێمە لە ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکاندا بەشداریی پارتایەتی و دواجار شۆڕشی ئەیلوول بوومە، واتا: کاتێك بەشداریی شۆڕشی ئەیلوولم کردووە، کە هێشتا (پارتی) بڕیاری شۆڕشەکەی نەدابوو. ئەوسای لەگەڵ جەلال عەبدولڕەحمان و رەشید سندی و زۆر هەڤاڵانی دیکەش کاری سیاسی و شۆڕشگێڕیی خۆمانمان دەکرد. بۆ مەسەلەی رەنگدانەوەشی بەسەر چیرۆك و رۆمانەکان و نووسینەکانمدا هەمیشە رەنگدانەوەکەیان هەبووە، بەڵام من توانیومە ئەو رەنگدانەوەیە بە شێوەیەکی هونەری رەنگڕێژ بکەم، چونکە من قەت وەکو سیاسییەك نانووسم، بۆیە ئەو ئەدەبەی نووسیومە دەکرێ وا وەسفی بکەین، کە ئیلتیزامە نەك ئیلزام، واتە بە ویستی هیچ کەس و لایەنێك نانووسم و ئەوە دەنووسم، کە خۆم دەمەوێ، واتە ماوەی کاری شۆڕشگێڕی و دەربەدەریی خۆم و خەڵکی کوردستان و پارتایەتی و شۆڕشی ئەیلوول و مەنفادا بەشێوەیەکی زۆر هونەری، لەنێو چیرۆك و رۆمانەکانمدا رەنگیان داوەتەوە.

- ویستم لەو تەوەرە شۆڕشگێڕییەی دانەبڕێنم، بۆیە پرسیاری ئەمەم لێ کرد، لە ژیانی لاوییەوە تا ئەمڕۆ چەند بە بارزانی مستەفای نەمر سەرسام بووی؟

لە وەڵامدانەوەدا گەشانەوەیەکم بە روخسارییەوە بینی، چونکە کەمێك وەستاو دواتر گوتی:

بارزانیی نەمر گاریبالدیی کوردە. تا نەچیتە ئەوروپا و لەوێ نەژیت، لە مەزنایەتیی مەلا مستەفای نەمر تێناگەی، چونکە لە ئەوروپا کورد بە بارزانی دەناسنەوە، بارزانیی نەمر باوکمانە، پێمwایە هەڵەیەکی گەورە دەکەین ئەگەر بارزانیی نەمر تەنیا بە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بناسێنین، چونکە ئەمە بچووککردنەوەیە و کەمکردنەوەیە لە شان و شەوکەتی ئەو مرۆڤە مەزنە، بارزانیی نەمر سیمبوڵ و سەرۆکی راستەقینەی کوردی هەر چوار پارچەی کوردستان بووەو دەبی من هەر وام ناسیوەو تا دەشمرم هەر وای دەناسم، دواتر ئەوەندە ئەو سیمبوڵە مەزنەم خۆشویستووە، هەمیشە حەزم کردووە وێنەکەی لەسەر دیواری ماڵەکەمدا

نەبێ، بەڵكو وێنەكەی هەر لە نێو دڵمدا بە زیندوویی بمێنێتەوەو هەمیشە لە جیاتی تەماشاكردنی سەر دیوار تەماشای ناخی دڵی خۆم بكەم، لەوێ وێنە زیندووەكەی ببینم.

- دوای ئەم قۆناغە هاتمە سەر قۆناغی ئەدەبیات، بەدەر لەوەی چاوەڕوانیی دەكرد، كە پرسیاری لەمەڕ چیرۆك و ڕۆمانی لێ بكەم، پرسیاری ئەوەم لێ كرد، كەس بە هونەرمەندێكی شێوەكاری تۆی نەناسیوە، بەڵام ئەمڕۆ خەریكی كردنەوەی پێشانگای و بەوەش كە من تابلۆكانتم دیون دەتوانم بڵێم هیچیان لە چیرۆك و ڕۆمانەكانت كەمتر نییە. بۆیە دەمەوێ لەم پێشانگایەوەو ئەم جۆرە هونەرەو چۆنیەتی فێربوونیشی و كردنەوەی پێشانگەكەشمان بگەیێنی؟ گوتی: ئەمە پرسیارێكی بە دڵی منە و دەرفەتی ئەوەم دەداتێ، كە پێش وەڵامی پرسیارەكەت، وەڵامی ئەوە بدەمەوە، كە جاران پێیان دەگوتم چیرۆكنووس، كە پێنج كۆچیرۆكم هەیە. ئەمڕۆ دەبێ پێم بڵێن ڕۆماننووس، چونكە حەوت ڕۆمانم بە چاپ گەیاندووە، بۆ وەڵامی پرسیارەكەشت، من ساڵێكی تەواو لە هەوڵی ئەوەدا بووم، كە ئەم پێشانگایەم لە گەلەریی (میدیا) بكەمەوە، بەڵام داخی گران، هەلیان بۆ نەڕەخساندم. بۆیە ئەمجارە، كە هاتمەوە بۆ كوردستان، بەوپەڕی دڵزویری تابلۆكانم لێیان سەندەوەو بەبێ چارچێوە لە كارتۆنم چەسپ كردن و بە سوپاسەوە لە هۆڵی (مەهدی خۆشناو)ی لقی هەولێری یەكێتی نووسەرانی كورد پێشانگا تایبەتییەكەی خۆمم كردەوە، ئەمەش دوو لەزەتی پێ بەخشیم، یەكەمیان: ڕەواندنەوەی خەمی نەكردنەوەی پێشانگا لە گەلەریی میدیاو دووەمیش: كردنەوەی پێشانگایەكە بەدەستی ئەدیبێك و لەنێو هۆڵی ئەو لقەی نووسەرانی هەولێردا كە ناوی مەهدی خۆشناویان بە شایستەترین ناو زانیوە بۆ ناوزەدكردنی.

- گوتم: ئەمە كە یەكەم پێشانگەتانە لە كوردستان، ئایا پێشینەی پێشانگا كردنەوەی دیكەتان هەیە؟

گوتی: بەڵێ، بەڵام لە دەرەوەی كوردستان، لە وڵاتی فنلندا سێ پێشانگای تایبەتیم كردۆتەوە، لەوێ باشترین ڕەخنەگر لەبارەیان نوسیم و لە گەورەترین ڕۆژنامەشدا باسیان كردووم، كە بەداخێكی گرانەوە، لە كوردستانی ئازادی خۆماندا ئەو ڕێگەیەم لێ گیردراو ئەمڕۆ نووسەرانی كورد لە هەولێر ئەو مرازەمیان بەوپەڕی

هەژاری بۆ ئەنجام دام لەژێر دروشمی (با رەنگ و هێڵ بپەیڤن) کە خۆم باسیان ناکەم، با بینەر باسیان بکات.

- لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوەتان بۆ بگێڕمەوە، کە رۆژی هەینی رێکەوتی ٣١ی ٣ی ٢٠٠٦ لەگەڵ شاعیر (نەژاد عەزیز سورمێ) سەردانی پێشانگەکەیمان کردو دوای تێڕامانێکی زۆر وردی تابلۆکان، هەردووکمان دانمان بەوە دانا، کە بەڕاستی عەبدوڵڵا سەڕاج دەکرێ وەکو هونەرمەندێکی بەتوانای شێوەکاریش بناسرێ و خودا شاهیدە پۆرترێتێکی بۆ خۆی دروست کردبوو، مەگەر هەر کامێرا بەو جۆرە دەریبهێنێ. ئەمە شایەتییەکە، لە تۆماری پێشانگاکەشیدا بۆیمان تۆمار کرد.

دێمەوە سەر دیمانەکەمان و لە پرسیارێکی دیکەدا گوتم: تۆ زیاتر بە لایەنگری حکوومەتەکەی هەولێر ناسراوی، بەڵام لە هاتنەوەی ئەمجارەتدا زیاتر لە میدیاکانی سلێمانی بەدەرکەوتی؟

- ئەوە زیاتر بۆ ئێوە دەگەڕێتەوەو حەز دەکەم ئەو پرسیارە لە خۆتان بکەن. (ئەمەو، کوا لە کام رۆژنامە و T.Vدا دیمانەم لەگەڵدا کرا؟ تەنیا وەزارەتی رۆشنبیری ئەرکی لە چوارچێوەگرتنی کەڤاڵەکانمی گرتە ئەستۆ و لە گەلەریی مۆزەخانەدا نمایشی کردو هیچی تر.)

گوتم: خودا شاهیدە لە خەڵکمان بیست کە گەڕایتەوە، ئەگەر نا، فەرموو، وا بە ناوی رۆژنامەی خەبات باشترین و تێرو تەسەلترین دیمانەت لەگەڵدا ساز دەکەم.

گوتی: سوپاست دەکەم بەڵام، خۆت باشم دەناسی، من هەر لە بنەڕەتەوە زۆر حەزم لە دەرکەوتن و خۆ دەرخستن و پراژکتۆر و رووناکی نییە، بەڵام بەخێرهاتنەوەو لەبارەوە نووسین و رەخنە بۆ هەموو ئەدیبێك هەم خۆشە و هەمیش هەموو رەخنەیەك وام لێ دەکات، بە خۆمدا بچمەوە، وەکو هەموو ئەوانەش حەز دەکەم لەبارەمەوە بنووسرێ و ناوم بێنن. زۆرجار بۆ دەستکەوتنی رۆژنامەیەك لەبارەی منی نووسیوە، شارەو شارم کردووە، بۆیە حەزم دەکرد ئێوەش هەمان گرنگیتان پێ بدامایە. کردنەوەی پێشانگەکە لە هەولێر و ئەم دیمانەیەی جەنابیشت زۆر فەرامۆشییان پێم بەخشی.

- ئەمجا هێنامە نێو دونیایەکی دیکە، لە پرسیارێکی تێرو تەسەلدا، باسی مۆسیقا بەگشتی و ئاواز و مەقاماتی کوردیم لەگەڵیدا کردو مەبەستە سەرەکییەکەشم

بریتی بوو لەوەی بزانم تا چەند ئەم هونەرە کاریگەری بەسەر خودی خۆی هەبووەو تا چ ئاستێکیش لە بەرهەمەکانی رەنگیان داوەتەوە؟

- ئەمە پرسیارێکی زۆر زیرەکانەیە، یەکەم جاریشە رۆژنامەنووسێك ئەو پرسیارەم لێ دەکات، بۆیە بەرایی سوپاست دەکەم و لە وەڵامیشدا دەڵێم: ئەم پرسیارە لای من دوو رێچکەیە، یەکەمیان: ئاواز و مەقاماتی رەسەنی کوردییەو دووەمیشیان: سیمفۆنیاکانی وڵاتانی رۆژئاوان، کە من بەشبەحاڵی خۆم شارەزای ئەو بوارە تایبەتمەندە نیم، بەڵام منیش گوێچکەم هەیە، حەز لە گوێگرتنی هەر هەموو ئاوازە رەسەنەکان دەکەم لەگەڵ گوێگرتن لە مەقامەکانی: قەتار و ئەڵڵاوەیسی و خاوکەر، کە لە ناخەوە دەمهەژێنن، بەرانبەر بە (حەیران)یش سەرەتا پێی نامۆ بووم، بەڵام دوای هەژدە ساڵ بەسەربردنی ژیان لەناو شاری هەولێر، خەریکی ئەوەم بە تەواوەتی زەوق لە حەیران وەربگرم، رەنگیشیان بەسەر کورتە چیرۆکەکانمدا داوەتەوە. بۆ بەشی دووەمی وەڵامەکەشم دەڵێم: سیمفۆنیاکانی مۆزارت و بتهۆڤن و باخ و شۆپان، بەم دواییەش لە رۆمانی (ونگە)دا، سوودێکی زۆرم لە (چوار وەرزە)کانی (ڤیڤالدی) وەرگرتووەو لە شوێنی خۆیشی بەکارم هێناون، کە زۆرجار لە غوربەتدا دەمگرێنێ و بە جۆرێك لە ناخم دەئاڵێ، کە ناتوانم لێی جیاببمەوە. لەم پێودانگەشدا (مەبەست لە بەکارهێنانی مۆسیقایە لە ئەدەبدا) پێموایە (هێرمان هیسە) بە پێشەنگ دەژمێردرێ.

- دوای ئەوە پرسیاری ئەوەم لێی کرد، کە ئێستا ئەو لە ئەوروپا دەژیێت و ئاگاداری دوا گۆڕانکارییەکانی دنیای چیرۆك و رۆمانە، بە کێ سەرسامە و لەوێشەوە چ رێبازێکی تازە فێر بووە؟

- لە دنیای تازەی ئەمڕۆکەی رۆمان نووسیندا هونەرێك پەیدا بووە پێی دەگوترێ (رۆمان لەناو رۆمان)دا، یان چیرۆك لەناو چیرۆکدا کە ئەمەش ناوی بە چیرۆك و رۆمانی پێشەنگ دەرکردووە، بە وێنە: من لە نێو رۆمانی (کاولاش)دا، ئەو هونەرەم بەکارهێناوەو زیاتریش بە (ئیبراهیم ئەلکونی) سەرسامم کە زۆر لە نوێخوازەکانی وەکو جەبرا ئیبراهیم جەبرای تێپەڕاندووەو رەنگە لە کوردستان نەناسراو بێت.

- دوایی گەڕایەوە سەر ئەسڵی مەقسەدی پرسیارەکەم و گوتی:

- رۆمان، یان چیرۆك بەلای منەوە دەبێ لە بۆتەی تەکنیك و هونەرکاریدا دەربېڕدرێت. لای من، رۆمان و چیرۆك تەنیا رووداو نین، بەڵکو هونەری گێڕانەوەیە، کە بە چ شێوەیەك دەیگێڕیتەوەو پێشکێشی دەکەی، ئەگینا زۆر نووسەرمان هەن-نامەوێ لێرەدا ناویان ببەم-هەر تەنیا رووداو دەگێڕنەوەو، هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ مێژوونووسان. ئەز پێچەوانەی ئەوانەم و ئەدەب دەنووسمەوەو رووداو و مێژوو دەکەم بە ئەدەب.

- لێرەدا هەڵوەستەیەکم پێی کرد، پرسیارێکی ترم لێی کرد، کە بریتی بوو لەوەی گوتم: من وەکو خوێنەرێکی بەرهەمەکانت سەرنجی ئەوەم لا دروست بووە، کە زۆرجار رۆمانێکت لە کورتە چیرۆکێکدا دروست کردووە، یان لەنێو رۆمانێکتدا کۆمەڵە کورتە چیرۆکێك دەبینم، ئایا ئەمەت پێ پرسیارێکی رەوایە؟

- نەك هەر رەوایە، بەڵکو پرسیارێکی زۆر هۆشمەندانەشە، کە هەمان پرسیارم لە هەفتەنامەی (باسەرە) لێ کرا، بەڵام نەیانتوانی مەبەستەکەی من بڵاوبکەنەوە، کە دەکرێ لێرەدا باشتر و جوانتر وەڵامەکە بدەمەوەو دەڵێم: بەرایی دەبێ باسی ئەوەت بۆ بکەم کە رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە) لە ساڵی ١٩٧٩ نووسیومە و لە ساڵی ١٩٨٤ دامە دەزگای رۆشنبیری بۆ چاپکردن، بەڵام بەداخەوە ساڵی ١٩٨٩ چاپیان کردو ساڵی ١٩٩٠یش بڵاویان کردەوە. ئەم رۆمانە سێ چیرۆکی گرتۆتە خۆی وەکو هونەری چیرۆك لەناو چیرۆکدا، هەمووشی ٢٠ لاپەڕە دەکات لە کۆی ٣١٠ لاپەڕەدا. رۆمانێکی دیی تازەگەرم ئەنجام دا، دواتریش لە فنلاندا جارێکی دیکە پێیدا چوومەوە پێنج بەشم (پار) بۆ زیادە کردو جارێکی دی چاپ و وەشانم کردەوە، بەبێ ئەوەی کەسێك هەستی پێ بکات. ئەمە ئەو راستییە دەگەیەنێ، کە گەلەکەی ئێمە نەخوێندەوارە و ئاگاداری هیچ جۆرە کەین و بەینێکی نووسەرەکانی نییە.

- لەو باری هەڵچوونەیدا، ویستم دیمانەکە گەرمتر بکەم، بۆیە گوتم: ئەدی چ بەوانە دەڵێی، کە لەو باوەڕەدان، کەوا کورد تا ئێستا نە رۆمان و نە هیچ رۆماننووسێکی هەیە.

لە وەڵامدا دوو سێ جار ملی باداو چاویلکەکەی هێناو برد و گوتی:

- ئەوانە شەکریان شکاندووە، کە ئەمڕۆ لە هەزارەی سێیەمی زاییندا بڵێین کورد رۆمانی نییە. رۆمانی زۆر باشمان هەیە، راستە کەمە و لێرەدا هەر هێندە دەڵێم: گوناهە بەراوردی ئاستی رۆمانی خۆمان لەگەڵ رۆمانەکانی رۆژئاوا بکەین، کە لەوێ تەمەنی رۆمان سەدان ساڵە و لێرەشدا هێشتا لە سەرەتاو دەسپێکداین، دەکرێ باسی ئاستی لاوازی رۆمانێکی دیاریکراو بکەین، بەڵام ئەمە ناسەپێتە سەر رۆمانە باشەکانمان.

- گوتم: واتە ئێمە رۆمانی باشمان هەیە؟

- گوتی: بەڵێ، تا ئاستی ئەوپەڕی شانازیش و دەتوانم زۆر بە راشکاویش پێت بڵێم، رۆمانە سەرکەوتووەکانی ئێمە زۆر چاکتر و سەرکەوتووترن لە رۆمانی وڵاتانی دراوسێمان، کە ئەوان دەوڵەتمەندن و ئێمەش لە سەرەتای دامەزراندنی فیدرالیەتین.

- لێرەدا ویستم تۆزێ هێوری بکەمەوە، بەڵام بە پرسیارێکی وروژێنەری تریش و لێم پرسی: لە گەڕانەوەی ساڵی پارتدا بۆ کوردستان، سێ رۆمانت لەسەر ئەرك و گیرفانی خۆت چاپ کرد. خێرە داوات لە دەزگایەکی چاپەمەنی نەکرد، ئەو سێ رۆمانەت بۆ چاپ بکەن؟

- گوتی: ئەمە حیکایەتێکە بۆ خۆی.

- گوتم: چۆن؟

- گوتی: لە ساڵی ٢٠٠٥ واتە ساڵێك پێش ئەمڕۆ، لەسەر شەرەفی رێزدار د. فوئاد مەعسووم پێشانگایەکی شێوەکاریم لە شاری (هێلسنکی)دا کردەوە. دوای پێشانگاکە و لە دانیشتنێکدا گوتی: هەر کارێك بەمن بسپێری لە خزمەتتدام. گوتم: هەرچەندە ئەمە بەکاری تۆ ناشێ، بەڵام کتابێکم هەیە حەز دەکەم بیگەیەنیتە دەزگای (سەردەم) تا بۆمی چاپ بکەن، لەو باوەڕەشدا بووم (شێرکۆ بێکەس) یەکسەر بە چاپی دەگەیەنێ، چونکە تا ئێستا زیاتر لە بیست قەسیدەم لەسەر داوای خۆی بۆ کردۆتە عارەبی، دکتۆر فوئاد گوتی: سەرچاو و ئەرکەکەی خۆشی بەجێ هێنا، بەڵام بەداخەوە و مخابن تا ئێستاش نەك هەر چاپیان نەکردووە، بەڵکو سانسۆریان خستۆتە سەری، هەر خۆشم هۆکارەکەی دەزانم و بڕو بیانووی سەیرم بۆ دێننەوە. جارێك دەڵێن بزر بووە. جارێك دەڵێن گرفتی هونەریی هەیە. دواجار کە خۆم چوومە لای شێرکۆ، گوتی: ئەرێ

کتێبێکی خۆتمان نادەیتێ بۆتی چاپ بکەین. زۆر تووڕە بووم و گوتم: شاعیری گەورەی کورد، ئەوها دەسەڵات دەزگایەکی رۆشنبیری بۆ دامەزراندی تا خزمەتی داهێنان ئەدەبی کوردی پێ بکەین. ئەی دۆشاو شیرین. ئەدی بۆ ئەوەی چەند ساڵە لاتە چاپتکردووە هەتا داوای کتێبی ترم لێ بکەی. بەهەرحاڵ لە دەزگای (ئاراس)یش، رۆمانێکم سێ ساڵ پتر دواکەوت. بۆیە لەو رۆژەوە لە دەزگاکانی چاپەمەنی تۆراوم و بڕیارم دا بە پارەی سۆسیالی هەژارانەی خۆم کتێبەکانم چاپ بکەم، چونکە جگەرەناکێشم و ناشخۆمەوەو دەتوانم ئەو سێ رۆمانە لەسەر ئەرکی خۆم چاپ بکەم، بەڵام بە تیراژی ٢٥٠ دانە، کە تەنیا بەشی ئەوە دەکات بە دیاری بیدەمە هاوڕێیە ئەدیبە خۆشەویستەکانم و ئەوانەی لێمەوە نزیکن، بەمەش زۆر خۆشحاڵم. بۆ ئاگاداریت رۆمانێکی دیم لە (بەرلین) دیسان لەسەر ئەرکی خۆم بە چاپ گەیاندووە.

- بە مەبەستی هێورکردنەوەی، دەرگایەکی دیکەم بۆ کردەوەو پرسیاری ئەوەم لێی کرد: تا چەند لەگەڵ رەخنەگراندا کۆکی، یان ئایا رەخنەگری راستەقینەمان هەیە، یان هەر برادەرایەتی و ناکۆکی سەرچاوەی گەورەکردن و بچووککردنەوەی بەرانبەرن؟

دوای وەستانێکی بەرچاو گوتی:

- قسەیەکی باو هەیە لە هەموو ئەدەبیاتی جیهاندا، کە کرۆکەکەی برتییە لەوەی، هەرگیزاو هەرگیز نووسەری داهێنەر لە رەخنەگرەکان رازی نابێت، چونکە ئەو هەموو وردەکارییانەی ئەدیبەکە کردوویەتی، رەخنەگرەکە هەستیان پێ ناکات، بۆیە کە من لە زۆر دیمانە و رادەربڕیندا گوتوومە رەخنەگرمان نییە. مەبەستم ئەوە بووە، کە رەخنەگری ئەکادیمیی بوارە تایبەتمەندە جیاجیاکانمان نییە، بەڵام بە نیسبەت مەسەلەی برادەرابەتی، ئەوا زۆر بە زەقی و وردی ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت لەوەی، شێرکۆ بێکەس بەرانبەر رۆمانەکەی (بەختیار عەلی) گوتوویە: نە مردم و رۆمانەکەی کاکە بەختیارم خوێندەوە. ئەمە بەشێکە لە شارچێتی کردن و (شتی دیکە)، چونکە لە بەرانبەری ئەوەدا، بەختیار بە شان و باڵی ئەو هەڵدەدا. ئەمە بە دیاردەیەکی باش

نازانم، ئەمە تەنیا رەخنەگرتنە: لە روالەتی یەکتر ناساندن و هەردوولا وەکو یەك باسی یەکتر دەکەن. ئەمە لەلای من رەت کراوەیەو، وەچەی ئەمڕۆ قەبوولی ناکات.

- گوتم: بەدیلی ئەوانە هەیە؟

- گوتی: بەڵێ، هەر بۆ نموونە برایان: (کەمال غەمبار)، (زاهیر رۆژبەیانی)، (عەبدوللا تاهیر بەرزنجی)، (سابیر رەشید)، (جەلیل کاکەوەیس)، (عەتا قەرەداخی)، (د. نەجم ئەلۆەنی)، (د. فوئاد رەشید)، (سەباح ئیسماعیل)، (ئارام سدیق)، (حەمە مەنتك)، (د. هاشم ئەحمەدزادە)، (نەجات حەمید ئەحمەد)، (عەبدولخالق یەعقووبی) و چەندانێکی دیکە.

- بە پرسیارێکی دیکە لەو تەوەرەم دوورخستەوەو بێ پێشەکی و پاشەکی، گوتم بەدەر لە چیرۆك و رۆمان، چ وەکو خوێندنەوە، چ وەکو نووسین، گرنگی بە چ لایەنێکی دیکەی ئەدەبی دەدەی؟

- با جارێ بێمە سەر خوێندنەوە، تا سەد کتێب نەخوێنمەوە، سەد دێڕ نانووسم، واتە من عاشقێکی خوێندنەوەم و بەڕاستیش وام. لە شارانی دیکەوە کتێب دەخوازم لە کتێبخانە گشتییەکان و پارەی پۆستەی دەدەم. وەکو حەزیش، حەزم زۆر لە بواری ئارکیۆلۆژییە لە شێوەکاری دانەبڕام و زۆری لەبارەوە دەخوێنمەوەو دەچمە زۆرینەی پێشانگاو مەتحەفەکانیش و هەمیشە رۆمانە زۆر و زەوەندەکانی هەندەران و خۆمانیش دەخوێنمەوە بەو زمانانەی کە دەیانزانم.

- کۆتایی ئەم وەڵامە دەرفەتی ئەوەی پێدام لێی بپرسم: چەند زمان دەزانی؟

- گوتی: بە بۆچوونی رەخنەگران و خوێنەرانی بەرهەمەکانم، کوردییەکەم زۆر باشەو بەڕای خۆشم عەرەبییەکەم لە کوردییەکە باشترە، سەرباری زمانی تورکی کە باشی لێ شارەزام و ئێستاش لە ئەوروپا زمانی سەرەکی خوێندنەوەو ئاخاوتنم ئینگلیزییەو بە زمانی فنلەندیش کاری خۆمی لە بازاڕاندا پێ دەسووڕێنم، زیاتر نا.

- هاتمە سەر تەوەرێکی دیکەو گوتم: کورد بێ شیعر هەڵناکا، تا ئەو ئاستەی دەڵێن کورد هەموویان شاعیرن، تۆ تا چ ئاستێك لە شیعر نزیکی و زمانی شیعریش تا چ ئاستێك رەنگدانەوەی لەسەر زمانی نووسینی تۆدا هەیە؟

- له بەرایی حەفتاکاندا شیعرم دەنووسی.

- گوتم: واتە بە شیعر لە سەرەتای حەفتاکاندا دەستت بەکاری نووسین کرد؟

- گوتی: نەخێر، من لە ساڵانی پەنجاو هەشت و نۆدا، نوێنەری ئەم ڕۆژنامەی (خەبات)ە بووم لە کەرکووك، ئەوسا بە زمانی عارەبی و بە نازناوی (ع. زامدار) وتارم دەنووسی. ئەوەش لە ئەرشیفی خەبات ماون. دواتر، کە زامدارەکان زۆر بوون (مەحموود زامدار و فەرید زامدار) لە هەولێر و (ڕەمەزان زامدار) لە کەرکووك، زامەکەی من سارێژ بوو، بوومە عەبدوڵڵا سەڕاج.

- چی تۆی لە چیرۆك و ڕۆمان نزیك خستەوە؟

- دوای ئەزموونە شیعرییەکەم و نووسینەکانی پێشینەم هەستم بەوە کرد، کە ئەز دەتوانم لە بواری چیرۆکنووسیدا زۆر باشتر خۆم تاقی بکەمەوە. کەوتمە دونیای چیرۆك نووسین و تا ئێستا پێنج کۆچیرۆکم بڵاوکردۆتەوە (لێرەدا دەرفەتی ئەوە دەخوازم، ئەو ڕاستییە بدرکێنم، کە دەستەواژەی (زاراوە)ی کۆچیرۆك، کۆ شیعر، جێکات و زۆر زاراوەی دیکەش من دامڕشتوون.) پاش ئەوەش، ئەو چیرۆکانەی کە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوم کردوونەتەوە، دوو سێ بەرگی کۆچیرۆکیان لێ دەردەچێ.

- ئینجا هاتینە سەر مەیدانی وەرگێڕان و گوتم: تۆ پێنج زمانی ئەم مەخلووقانە دەزانی و هەر بە کوردیش دەنووسی ئایا خەڵکی دیکەی وڵاتان و کیشوەری دیکە (بە وەرگێڕان) بەرهەمەکانی تۆیان پێگەیشتووە؟

- بەڵێ، بەڵێ دوو کۆچیرۆك و ڕۆمانێکم وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فەڕەنسی و پەخش و بڵاو کراونەتەوە. (هەڵکشان بەرەو لووتکە) لەلایەن دکتۆر ئەحمەدی مەلاوە و (لاکێشە رووناکەکان) لەلایەن کاك ئیسماعیل دەروێشەوە وەرگێڕدراون و بڵاوکراونەتەوە دەبێ لێرەدا سوپاسیان ئاڕاستە بکەم، هەمیش ماندووبوونیان بە بەرزی بنرخێنم (هەروەها کاك مستەفای ئیلخانی زادەش بەخۆی ڕایگەیاندم کە هەمان ڕۆمانی کردۆتە فارسی. کۆچیرۆکێکی دیش، بە تێکەڵی لەلایەن گرووپی نووسەرو هونەرمەندانی پاریسەوە کراوەتە فەڕەنسی).

- ئەدی مەسەلەی رۆماننووسین و ئەزموونی ئەو حەوت رۆمانەت، سەرچاوەکەی چییە و لە کوێوەیە؟

- رەنگە وەڵامەکەی منت لا سەیر بکەوێتەوە، کە لە یەکێك لە مەربەدەکاندا (مەحموود زامدار) پێی گوتم: دەبێ تۆ رۆمان بنووسی. گوتم: بۆ؟ لە وەڵامدا گوتی: ئێوەی کەرکووکی لە ململانێی شارستانییەکاندان و کێشە ناسیۆنالیستەکانتان لە ترۆپکەدایە، هەربۆیە دەکرێ ئێوەی چیرۆکنووس رۆمان بنووسن. لە وەڵامدا گوتم: تا ئەمڕۆش سێ بەشی رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە)م نووسیوەو لە ماوەیەکی زۆر کورتیشدا بە تەواوی بەدەستت دەگات، کە مێژووی ئەم قسەیەم دوای ساڵی ۱۹۷۹یەو لە ساڵی ۱۹۸٤بە نیازی چاپ دام بە دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا و لە ۱۹۹۰دا بڵاویان کردەوە. کۆمەڵێك پیلانگێڕان دەستیان تێخست بۆ ئەوەی نەبێتە پێشەنگی رۆمانی کوردی، ئی (حوسێن عارف) کە پاش من نووسیویەتی زووتر چاپ بکرێت. ئەمشیان وەك مەبەست کرد. بەڵام لە بنەڕەتدا ئەوەی من پێش ئەی (حوسێن عارف) نوسراوە، بەڵام هی ئەو لە چاپکردن پێشئەوەی من کەوت.

- تەوەرێکی دیکەم بۆی کردەوە، لە پرسیارێکدا گوتم: ئەدیب و هونەرمەندە کەرکووکییەکان زۆر سوودیان لە ئەدا و دەنگ و تەریقەتەکانی نێو تەکیە و خانەقاکان وەرگرتووە، جەنابتان چ جۆرە سوودێکت وەرگرتووە؟

- پرسیارێکی باشە و بە نەشازی نازانم، بەڵام من کەسێکم سەکیۆلارم Secular واتە عەلمانیم، بەڵام زۆریش بەدوای سۆفیگەریدا گەڕاوم و زۆر لە کتێبە زەردەکانیشم خوێندوونەتەوەو، بەدوای شێخ محێدینی عارەبی و (ئەلنیفەری)دا زۆر گەڕام، کە لەگەڵ سۆفیزمی کوردی بە نموونە (مەحوی) و (نالی). لە ئەدەبیاتی خۆشماندا سوودم لێ وەرگرتووەو، رەنگدانەوەشیان هەبووە، بەتایبەتیش ئەفسانە (سیمبوڵیيە)کانی (فەریدودینی عەتتار).....تاد، بۆیە دەتوانم بڵێم: رۆمانەکانم بە ئەفسانەکردنی نووسینە.

- هاتمە سەر قۆناغی هەندەران و گوتم: لە چوونت بۆ هەندەران و دوورکەوتنەوەت لە کوردستان، زێدی خۆت و باب و باپیرانت چەندەت زەرەرکرد و چەندەش قازانج؟

- باوەڕ بکە بە قەد زەرەرەکە قازانجم کردووە، چونکە لە شوێنێکدا گوتوومە: من خۆم بە رووەکێك دەزانم، کە رەگم لە ئاسمانە، نە لە کوردستان باش ئاودێر دەکرێ و نە لەوێش دەحەوێتەوە. من ئاوارەییم لەگەڵ خۆشمدا هەیە و گلەییش لە ئاوارەبووندا ناکەم، چونکە وایان لێ کردووم بە ئەتڵەسی بیرکردنەوەمدا بچمەوەو لەوێ هەموو شتێ لەبەر دەستە وەکو سیمفۆنیا هەرە بەناوبانگەکان و کتێبە دەگمەنەکان و هەموو شتێکی دیکەی خۆراکی رۆحی، سەرباری ئەوەی لەوێ بەهۆی سەتەلایتەکانەوە ئاگام لە هەموو شتێکە، بەڵام ئەوەی کە لە دەستم داوە، بریتین لە هاوڕێیە بێ سەوادەکانم لە بازاڕی شێخەڵڵاو تەزبیح فرۆشەکان کە زیاترن لە رۆشنبیرەکان و زۆریش سوودم لە دیالۆگەکانیان وەرگرتووەو زۆریش راستگۆن و هەر لێرەشدا پۆزشی ئەوەیان بۆ دەهێنمەوە کە کەوتوومەتە نێو ساڵەوە و لەوێ تەندورستیم متمانەتر دەکرێ.

- بازم بەسەر هەندەران دا و گەڕامەوە سەرەتای خەباتی گوتم: تۆ پێشمەرگەی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول بووی، ئایا بەم شێوەیە خوێندراویتەوەو هیچ جۆرە حیساب و کیتابێکیشت بۆ کراوە؟

- من پێش ئەوەی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بم، لە ساڵانی پەنجاکاندا وەکو ئەندامێکی پارتی کارم دەکردو پێش ئەو شۆڕشەش فەرمانی دەسگیرکردنم دەرکراو، ناچار بووم خۆم بشارمەوە کە ئەوسا یاریدەدەری بەرپرسی ناوچەی کەرکووك بووم، پاش چەند مانگێکی رێکخستنی خەباتی نهێنی لەناو شاردا، بردمیانە سەرەوەو ئەوسا لە تەك جەلال عەبدولڕەحمان و رەشید سندی و عادل عیزەت و مەلا شوکر و مەلا موسا و کوێخا شەریفی سەیدان و مەلا مەجیدی مۆردخواردەیی و دەیانی دیکەی وەکو مولازم سوبحی و عەریف حەمید و عەریف حەسەندا، خەباتمان کردو ماینەوەو لە هەموو ئەدەبیاتی منیشدا رەنگیان داوەتەوە، بەڵام گلەییم لەوەدایە، کە تا ئێستا ناسنامەیەکی پێشمەرگەی ئەیلوولیان بۆ نەکردووم. من مووچەکەی رەت دەکەمەوەو تەنیا و تەنیا، ئەو ناسنامەیەم بۆ یادگاری دەوێ، کە بیسەلمێنێ ئەز پێشمەرگەی ئەو شۆڕشە بوویمە و سەرکردایەتیی کوردیش دان بەو خەباتەی مندا بنێ،

بۆیە تکاتان لێ دەکەم، بەبێ مووچە، ناسنامەیەکی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوولم بۆ دروست بکەن و بەوەش شانازی دەکەم.

- هاتمە سەر خەڵاتکردنی ئەدیبان و گوتم: تا چەند تۆیان لەبیر بووەو ئەم جۆرە خەڵاتکردنانە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

- پێشەکی دەکرێ بێژم: خەڵاتکردنی ئەدیب کارێکی زۆر پیرۆزە، بەڵام نەجمەدین مەلای رەحمەتی گوتوویەتی: (گەلی کورد زیندوو نێژی مردوو پەرستە.) بۆیە، کە دەمرم خەڵاتم گەرەك نییە، ئەمرۆ لە کوردستاندا پێنج جۆرە خەڵات دابەش دەکرێن، بەڵام بەداخەوە هەر هەموویان لەسەر بنەمای سیاسی دابەش دەکرێن، کە بریتین لە خەڵاتی: (ئاراس) و (موکریان) و (عەنقا) و (ئەردەڵانی) و (باوەگوڕگوڕ)، دەکرێ بێژم شتی چاکن، بەڵام هەمیشە کەسە داهێنەرەکان فەرامۆش دەکرێن. وەکو فەلەکەدین کاکەیی تەقاندییەوەو گوتی: (ئێستا من خەڵات دەکرێم، بەڵام زۆر کەس لەبیر کراون و لەبیر دەکرێن).

- هێورم کردەوە بەوەی گوتم: ئێستا چیت لەبەر دەستەو چی دەنووسیت و خەریکی چیی؟ بەڕاستی هاتە سەر دۆخی ئاسایی خۆی و گوتی:

- چوار ساڵە شۆکم گرتووە بەرانبەر چاپکردنی ئەو کتێبەی کە داومەتە ئیدارەی سلێمانی بەناوی (بەرەو ئاستانەی رۆمانی نوێ و گۆشەنیگاکانم)، کە نە چاپی دەکەن و نە دەشمدەنەوە. دواتر، ئێستا خەریکی بڵاوکردنەوەی کتێبێکم لەبارەی ئێستێتیکا، هەروەها کۆکردنەوەی وتارە ئەدەبی و رەخنە ئامێزەکانم بەناوی (پەیڤستان) و لە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپی دەکەم، ئەگەر لایەنێك چاپی نەکرد ئەوا لەسەر ئەرکی خۆم بە چاپی دەگەیەنم.

- لێرەدا رامگرت و گوتم: هەر لێرەوە بانگەشەت بۆ دەکەم کە دەزگاکانی خۆمان بۆت چاپ بکەن.

- رۆمانێکیشم لەگەڵ خۆم هێناوەتەوە، کە حەوتەمین رۆمانمەو، زۆر بە ئەزیەتیش لە سانسۆری عەسکەرتاریی تورکانم رزگار کرد، بەوەی زۆر بە چاکیم شاردبووەوە. لەژێر ناوی (پەرتەوازە ئێرە و ئەویکانی رەوان)ە، تێیدا وەکو ئاینشتاین بیر دەکەمەوە،

که نه (جیّ) هەیە بەجیا و نه (کات)یش هەیە بە جیا، بۆیە (جێکات) دەناسم و کردوومەتە ناوی ئەو رۆمانەم.

- دوای ئەوە گوتم: خەڵکی دیکە لە دوا پرسیاردا ئازادی بە بەرانبەرەکەیان دەدەن، بەڵام من پرسیارێکت لیّ دەکەم و دەڵێم: من کە چیرۆك و رۆمانەکانی تۆم خوێندۆتەوە، زۆر هانا بۆ بەکارهێنانی رەمز دەبەی. ئەمە لە ترسی سانسۆرە، یان هونەرێکە لای ئێوە؟

- هێماندن، یان وەکو تۆ ناوت نا رەمز، یان وەکو ئینگلیز پێی دەڵێن سیمبوڵ Symbol لای من هەمیشە ئامرازی هونەرییە، ئەگەرچی بەکارهێنانی ئەو رەمزانە لە سەردەمی بەعسی ئاوەو ئاوچوودا، لە زۆر سەریەشەی پاراستم، بەڵام قەت لە ترسی سانسۆر هانام بۆ نەبردووە، بەڵکو هەمیشە لەلام هونەرێك بووەو، زۆرجار من لە بەرهەمەکانمدا باسی پێشمەرگەم کردووەو بانگیش کراومەتە بەغدا و محاسەبەیان کردووم، بەڵام ئەمڕۆکە لە ئەوروپا دەژیم (هەروەهاش لە پاش راپەڕین) لێرەو لەویّ بەعس نەماوەو ئەوپەڕی ئازادیی دەربڕینیش هەیە، لەگەڵ هەندێش رەمز بەکاردەهێنم وەکو جوانکاری، کە ئەمەش ئەوە دەسەلمێنیّ، لە ترسی سانسۆر نییە، چونکە سانسۆر لە هەردوولا بوونیان نییە. بۆیە دەتوانم دوای ئەو روونکردنەوەیە بڵێم: رەمزاندن لە هەموو جۆرەکانی ئەدەبدا، شیعر، چیرۆك، رۆمان، هەروەها شانۆکاری و شێوەکاریش هەتا لە سەما و مۆسیقاش، یەکێکە لە جوانکارییەکانی دەربڕینی نویّ.

- قسە قسەی راکێشاو نازانم چۆن هاتینە نێو دونیای تاراوگە و ئاوارەیی و دەربەدەربوون و مەسەلەی دوا پرسیارمان لەبیر کردو دیاربوو لە قسەکردندا من هاتبوومە سەر ئەو مەسەلەیە و ئەویش کەوتە وەڵامدانەوە:

- لە ژیانی ئاساییمدا زۆر ئاوارەیی و دەربەدەریم دیوەو وەکو خۆت گوتت، بۆیە بە پێویستی نازانم ئەو یادەوەرییانە دووبارە بکەمەوە، دەکریّ وەکو مانایەکی فەلسەفی و وەڵامێکی زۆر تازە بێژم: ئەمڕۆ من خۆم لەگەڵ ناخی خۆمدا ئاوارەم و بەدەر لەوەی لە هەندەراندا دەژیم، لەگەڵ ناخی خۆمدا ناکۆکم و ئاواتی ئەوە دەخوازم، بەرهەمەکانم

ئاوارەو غەوارە نەکرێن و بە زیندوویی بپارێزرێن. واتە مەبەستی سەرەکیم ئەوەیە خەباتی رۆشنبیریم لەکەدار نەکرێ و هیچ غەمێکیش لە شێواندنی بارودۆخی سیاسیم ناخۆم، چونکە هەمیشە لەگەڵ بزاڤی سیاسیی گەلەکەی خۆمدا بوومە.

- گوتم: برای گەورەم، دیمانە لەگەڵ تۆدا کۆتایی پێ نایێ، بە چی کۆتایی بەم دیمانەیە بهێنین؟ گوتی:

- دەمەوێ لە دوا وەڵامدا بڵێم، کە ئەز لە بەرهەمەکانمدا لە سێ شتی قەدەغەکراو، بەهیچ شێوەیەك گرنگیم بە ئاکاری وەڵامدانەوە نەداوە، هەرسێ هزرەکەش پێویستییان بەوپەڕی وشیاری هەیە بۆ دەربڕین و رەتکردنەوەیان، کە بریتین لە: (سێکس) و (ئایین) و (سیاسەت). من زۆر بەڕاشکاوی لەسەریان وەستاومەتەوە، کە هەرسێکیان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بڤەو تابۆ و قەدەغەن.

- لە دوا وەڵامی پرسیاری سێکس و ئافرەت و بەرگریکردندا گوتی:

- لای من، بەرگریکردن لە سێکس و مافە رەواکانی ئافرەتان، ئەوە نییە، کە پیاوان باسی دەکەن، بەڵکو ئەوەیە، کە ئافرەتان خۆیان بە نهێنی و شەرم و تەمومژاوی باسی لێوە دەکەن، کە هێشتاکە نەوێراون بە روونگەرایی باسی بکەن.

- بەهەر حاڵ پرسیارگەلێکی زۆرترم هەبوون، ئەویش ئامادەی وەڵامدانەوە بوو، بەڵام کات و سات فریای ئەوەی نەداین و هەر بۆیە لە کۆتاییدا بەڵێنی ئەوەم پێیدا، کە دوا پرسیار لە دیمانەکانی دیکەدا لێی دەکەم و چاوەڕوانی وەڵامی پرسیارە داخراوەکان بن، ئەگەر تەمەن مەودا بدا.

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# نووسین و داهێنان پێوەندی بە زەمەن و سەردەم و ئایدیۆلۆژیاوە نییە



دیمانە: سەلاح حەسەن پاڵەوان

ڕۆژنامەی رووبەری داهێنان، ژمارە ٦٦

عەبدوڵڵا سەڕاج بە هونەر و تەکنیکی نوێوە هاتە نێو دنیای چیرۆکنووسین، سەرەتا بە چیرۆکی (راوە گورگ) دەستی پێکرد، لەو چیرۆکنووسانەیە کە بەردەوام هەوڵی داوە سوود لە شێوە و فۆڕمە هەمەچەشنەکان ببینێ بۆ سەرسامکردنی خوێنەر.

ناوبراو خاوەنی شێوازی تایبەتە لە چیرۆکنووسین و رۆماننووسیندا فەنتازیا و فۆڕمالیزەی نووسین دەکات و سوود لە بەکارهێنانی زانستە گرنگەکانی کیمیا و فیزیا و هونەری شێوەکاری وەردەگرێ.

لە حەفتاکانەوە سەرقاڵی نووسینی چیرۆکە، یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی (لاکێشە رووناکەکان) بوو، هەروەها ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لەلایەن (ئیسماعیل دەروێش)ەوە پەرچڤەی فەڕەنسی کراوە لە پاریس، یەکەمین رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە) لەلایەن دکتۆر (ئەحمەدی مەلا)وە پەرچڤەی فەڕەنسی کراوە، هەروەها بۆ فارسیش وەرگێڕدراوە.

سەرەڕای ئەوانەش خاوەنی ئەم کۆمەڵە چیرۆکانەیە: (مردوو خەون نابینێ) و (بارام ناوێك هەبوو) و (پەڕەنگ) و (پەیك) و (سەرجەمی کۆچیرۆکەکان)، ئەمەی دوایی لەلایەن دەزگای ئاراسەوە چاپ کرا. هەروەها کۆمەڵێ رۆمانیشی بە چاپ گەیاندووە لەوانە (هەڵکشان بەرەو لووتکە) و (کاولاش) و (سۆناتای رۆح) و (کۆچڕەو-کۆچڕەو) و (ونگە) و (ئەژدەر) و (پەرتەوازەی ئێرەو ئەوێکانی رەوان) و (ناوێ لەم تێکستە بنێ) و (سلێکووك.. هۆکلێر).

لەم دیمانەیەدا ئەو پرسانە باس دەکات، کە پێوەندی بە ژیانی چیرۆکنووسین و رۆماننووسیی خۆیەوە هەیە، هەروەها ئاماژە بە پێوەندییەکانی ژانری چیرۆك و رۆمان دەکات.

- چۆن کەڵکەڵەی چیرۆکنووسینت کەوتە سەریەوە، ئایا چیرۆك تۆی دۆزییەوە، یان تۆ چیرۆکت دۆزییەوە؟ ئایا رازیت لە یەکەم چیرۆکت کە نووسیوتە؟

- دەکرێ بڵێم چیرۆك منی دۆزییەوە نەك من چیرۆکم دۆزیبێتەوە، یەکەم چیرۆکم ساڵی ١٩٧٣ بە ناونیشانی (راوە گورگ)، لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٩)دا بڵاوکردەوە،

وەك یەكەمین چیرۆكم لێی رازیم و شانازی پێوە دەكەم، وەك چیرۆك ئەو كاتە زیاتر لەژێر كاریگەریی بیری كوردایەتی بووم، ئەو چیرۆكە باس لە بەسەرهاتی نێوان منداڵ و باوكێك دەكات، باوكی ئەو كوڕە دەڕوا بۆ پێشمەرگایەتی و منداڵەكەش هەموو رۆژێ لە دایكی دەپرسێ كەی باوكم دێتەوە؟ ئەویش دەڵێ: سبەی، سبەی، ئیتر ئەو منداڵە هەر لە چاوەڕوانیدا دەبێت.

- بەكارهێنان و كۆلاجكردنی هونەر و زانست لەنێو چیرۆكدا لە زۆر لە چیرۆكەكانی تۆوە زۆر بەزەقی دیارە، ئەو شێوازە لە كوێوە سەرچاوەی گرتووە؟

- هەر لە سەرەتاوە كاتێك كە لاو بووم لە ساڵەكانی ١٩٤٦ و ١٩٤٨ سەرقاڵی نیگاركێشی بووم، واتە پێش ئەوەی دەست بدەمە قەڵەم خەریكی هونەر بووم و لە مەلاخەنەكە و بەرد و دار پەیكەرم دروست دەكرد و ئەمانەشم لە چاوپێكەوتنەكانی تردا دووبارە كردووەتەوە، بۆیە شێوەكاری لەگەڵمدا ئامادە بووە و ئێستاش هەر خەریكی نیگاركێشیم، لە فینلەندا (٥) پێشانگەم كردووەتەوەو لە هەولێر پێشانگەیەكم كردەوەو بردمە كەركوك و سلێمانیش.

- كەواتە هونەر لای تۆ بووە بە خەونێك و دەسەلاتی خۆی گواستووەتەوە بۆ چیرۆك و ئەدەب و كارە ئەدەبییەكان؟

- چیرۆك و هونەر و شیعر و شانۆ هەر هەمووی بەیەك پارچە دەزانم، ئەمەش مۆدێرنە ستایلی تازە لەو تێكەڵكردنە دەبینم لە رۆمانەكانمدا بڕێكی زۆر لە خوێنەران و رەخنەگران ئاماژە بەوە دەكەن كە من شێوازی واقیعی سیحری و فەنتازیا بەكاردەهێنم، بەڵام (دكتۆر فوئاد رەشید) لە رەخنەیەكدا كە ئاماژەی بە كارەكانم كردووە، دەڵێ شێوەی بەكارهێنانی هونەری و فەنتازیا نەك تەنیا لە رۆمانەكانیدا، بگرە لە چیرۆكەكانیشیدا بەزەقی هەیە و دیارە، هەروەها لە لاكێشە رووناكەكاندا كە سەرەتای چیرۆكەكانمە سوودم لە هونەرە هەمەچەشنەكانی ئەندازیاری و هونەری وێنەكێشان وەرگرتووە، لاكێشە رووناكەكان لەلایەن شاعیر (ئەحمەدی مەلا) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەڕەنسی.

هەر لە لاکێشە رووناکەکانەوە وردە وردە گەیشتوومەتە ئەم حاڵەی ئێستا، کە ببمە چیرۆك و رۆماننووس، بۆیە شانازی بە هەموو کارەکانمەوە دەکەم.

- ئایا چیرۆکی (بارام ناوێك هەبوو) ناکرێ سەرەتایەك بێت بۆ گواستنەوەی شێواز لە چیرۆکی هونەریی دوور لە ئایدیۆلۆژیا، واتە لەوێدا تەقینەوەی هەستە نەتەوەییەکان دەستی پێکرد؟

- وەك دەزانی من لە زۆربەی چیرۆکەکانم نارەزاییم دەربڕیوە، نارەزایی سیمای دیاری چیرۆکەکانم بووە، ئەوکاتەی کە ئەو چیرۆکەی تێدا نووسراوە، سەردەمی ژیانی من و کەسانێکی زۆری وەك من بووە لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا، ئەوکاتە من بە چیرۆکەکانم خەباتم کردووە دژی بەعس و داگیرکەر، بەڵام ئێستا بارودۆخەکە گۆڕاوە ئێستا کارەکانم زیاتر دژ بە گەندەڵی و پێشێلکردنی دیموکراسییە، راستە من پەنام بردووەتە بەر ئایدیۆلۆژیا و مەسەلە نەتەوەییەکان، بەڵام بەشێوەی رەق و وشکی ئایدیۆلۆژی نەمخستووەتە روو، بگرە بە شێوازێکی تەکنیکی بەکارمهێناوە.

- کاتێ کە لە چیرۆکەوە رووت کردە رۆمان ئایا ئەم رووکردنە بریتی بوو لە راوەستان لە چیرۆکنووسین و بێ دەسەڵاتی دەربڕینی شتەکان بە چیرۆك، یاخۆ لە رووی فۆرم و ناوەرۆکەوە رۆمان بە درێژبوونەوەی چیرۆك دەزانی؟

- ئەگەر پێناسەی رۆمان بکەین رۆمان مۆدێرن بەپێی لێکدانەوەی مۆدێرنیزم رۆمان بریتییە لە چیرۆك لەناو چیرۆك، چیرۆکی هەڵکێش چیرۆکی هاوتەریبی چیرۆکی چیرۆکەکان، رۆژنامەنووسێ رەخنەی لە من گرتبوو گوتبووی عەبدوڵڵا سەراج هەر چیرۆکەکانیەتی دەیکاتە رۆمان، گوتم راستە من لە رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە) چەند چیرۆکێکم کردووە بە رۆمان، بەڵام ئەو چیرۆکانە هەر خۆی لە بناخەوە بۆ رۆمان نووسراون، بەڵام ئەو دوو چیرۆکەی، کە بڵاوبووتەوە بۆ رۆمان نووسراون، بەڵام ئەو دوو چیرۆکەی کە بڵاوبووتەوە هەمووی ناکاتە ٣٠ لاپەڕە، هەر رۆمانەکە خۆی زیاتر لە ٣٠٠ لاپەڕەیە ئەی ئەو لاپەڕانەی تر لە کوێوە هاتوون، هەروەها ئەوەش بە گرفتێکی گەورە نازانم، رۆماننووسە گەورەکان ئێستا رایان وایە کە تازەترین رۆمان ئەوەیە کە چیرۆك لەناو چیرۆکدا بێت، دەکرێ ئەو

چیرۆکانە جیا بکەیتەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەتوانی تێهەڵکێشی بکەیت وەك رۆمان، کە تێهەڵکێشت کردن ئەو کاتە پێوەندییەك پێکەوەیان دەبەستێتەوە، پێوەندیی جوانکاری، یان هونەری، یان رووداوە یەك لە دوای یەکەکان.

- چیرۆکنووسێکی شێوازی تێگەیشتنی چیرۆکەکانت خوێنەری بەتوانا و زانیاریی دەوڵەمەندی دەوێ، ئایا خۆت وەك چیرۆکنووس کاتێ، کە دەنووسی، بیر لەوە دەکەیتەوە، کە خوێنەر لە نووسین و چیرۆکەکانت بگەن، یان لەو دەستەواژانە بگەن، کە دەینووسی؟

- جار جار بیر دەکەمەوە دەڵێم ئەم چیرۆك، یان ئەو چیرۆکم شێوازەکەی بۆ خوێنەر سەختە با بیانگۆڕم، بەڵام لە دواجاردا چیرۆکەکە خۆی بڕیاری خۆی دەدا، بەڵام ئەگەر راستییت دەوێ نەخێر، کە من دەنووسم هەرگیز بیر لە خوێنەر ناکەمەوە، بەڵام ئارەزوو دەکەم خوێنەرەکانم ئاستیان بەرز بێت و ماندوویان بکەم، وا لە خوێنەر دەکەم کە بە دووی زانیاریدا بگەڕێ و پرسیار لە خۆی بکات، دەبێ وا لە خوێنەر بکەیت کون و کەلەبەرەکانی تەکنیك بدۆزێتەوە، تا ئەم ساتەش هەندێ جار خۆشم کە شتێك نازانم لە خەڵکی دەپرسم و پرسیار لە بارەی هەموو شتێکەوە دەکەم.

- وەك خوێنەرێ هەندێ جار، کە چیرۆکەکانی تۆ دەخوێنمەوە ئەگەر شارەزاییم لە ئەندازە و هونەر و شێوەکانی هونەر و مۆسیقا و پەیکەرتاشی و کیمیا و مێژوو نەبێ، زۆر سەختە تێیان بگەم، تۆ ئەم گرفتە چۆن لێکدەدەیتەوە؟

- راستە لە حەفتاکان هەندێ لە رەخنەگران هەمان رەخنەیان ئاراستە دەکردم، کە ئاستی نووسینی چیرۆکەکانم بۆ خوێنەری ئاسایی سەختە، رەخنەگرێ لەبارەی شێوەی نووسینی من نووسیبووی و گوتبووی (عەبدوڵڵا سەڕاج باشترە لەماڵەوە دانیشێ و خزمەتی باخچەکەی بکات لەوەی ئەم چیرۆکانە دەنووسێ، کە کەس تێی ناگات)، کەچی هەر ئەو رەخنەگرە ئێستا دەست بە شانمدا دێنێ و خەریکە لەبارەم دەنووسێ، کەواتە من لە بواری چیرۆك پێشکەوتووترم لەو رەخنەگرە، ئەوکاتە خەڵکەکە دواکەوتوو بوو چیرۆکەکانی من پێش تێگەیشتنی خەڵکی کەوتبوو، ئەوە خەمی من نییە خەڵکی تێناگەن، هەر بۆ نموونە وەك (محەمەدی مەلا کەریم) دەڵێ ئایا (نالی) شیعری بۆ ماستفرۆشەکان نووسیوە؟

- چیرۆکێکت هەیە بە ناوی (پەیکەر) بە دوو بەش بڵاوت کردووەتەوە (پەیکەر یەك) و (پەیکەر دوو) ئایا لەو دوو چیرۆکەدا هەوڵی نووسینەوەی ژیانی خۆت داوە، یان هەوڵت داوە روانینی هونەریت لە رێگەی وێنەی خۆتەوە بخەیتەڕوو، واتە بەسەرهاتی منداڵیت و گەورەبوونت؟

- ئەگەر رۆمانەکانم بخوێنیتەوە هەست دەکەیت لە رۆمان و چیرۆکەکانمدا بەشێك لە گێڕانەوەی ژیانی خۆمی تێدایە، نەك هەموو ژیانم بگرە بەشێك لە ژیانم، سەردەمی منداڵیم و پێشمەرگایەتیم، تەنانەت ناوی منداڵەکانیشمی تێدایە، لە یەکێك لە چیرۆکەکانم ناوی هەموو منداڵەکانم بەکارهێناوە، ئەگەر ئێستا لە منداڵەکانم هەندێکیان بپرسی باوکت چەند کتێبی هەیە نازانن، بۆیە هەموو بەرپرسیارییەکی کارەکانم بەخشیوە بە هاوڕێی و شاعیری نوێخواز (سەباح رەنجدەر)، لە پەیکەری دووەم باسی هونەرمەندێ دەکەم کە پەیکەری من دەکێشێ.

- ئایا تۆ وەك چیرۆکنووس ئاگات لە نەوەی هەشتا و نەوەدەکان هەیە، ئایا ئەوان نەوەکانی پێش خۆیان تێپەڕاندووە؟

- بەڕاستی هەتا نەچووبوومە دەرەوەی وڵات ئاگام لەو نەوەیە هەبوو، بەڵام کە چوومە دەرەوە ئاگام لێیان نەما، بەهۆی نەگەیشتنی چاپەمەنی و نەبوونی پێوەندیم بە ئینتەرنێتەوە، ئێستاش وردە وردە چیرۆکی هەندێ لە چیرۆکنووسانی نوێ لە نەوشەفەق دەخوێنمەوە، بەڵام هەست دەکەم گەشەکردنێ لە چیرۆکدا هەیە، بەڵام بە چاونەترسییەوە راستییەك هەیە دەیڵێم نەوەی هەشتا و نەوەدەکان و دوو هەزارەکانیش هیچیان هیچ لە نەوەی حەفتاکانیان تێنەپەڕاندووە.

- ئایا هەست ناکەی ئەم بڕیارە لەبارەی ئەو هەموو نەوەیە بڕیارێکی توندوتیژە؟

- لەبەر ئەوەی کە شتەکانیان دەخوێنمەوە دەبینم بابەتەکانیان زۆر سادەیە و قووڵییەکی تێدا نییە، وەك بابەت دووبارەکردنەوەی هەمان بابەتەکانی پێشووە وەك تەکنیکیش هەر گێڕانەوەیەکی ئاسایی بێ تەکنیکە.

- بەڵام کۆمەڵێ چیرۆکنووس هەن کە ئێستا لەناو چیرۆکی کوردیدا رۆڵیان هەیە وەك (عەتا محەمەد، جەبار جەمال غەریب، ئارام کاکەی فەلاح، کاروان عومەر کاکەسوور) ئەمانە چیرۆکنووسی باشن؟

- بەڵێ ئەمانە چیرۆکنووسی باشن، زۆر ئاگاداری هەموو ئەو چیرۆکانە نیم، کە بڵاو بوونەتەوە، بەڵام ئەم ناوانەی گوتت لە باشەکانن، بەڵام کە گوتت چیرۆکنووسی باش مەرج نییە هەموو چیرۆکەکانی باش بێت، من خۆم لە چیرۆکەکانمدا چیرۆکی خراپم هەیە و لە رۆمانەکانیشمدا رۆمانی خراپم هەیە، ئەمە کەوتووەتە سەر رەخنەگر، بۆ نموونە رەخنەگر هەیە سەر بە ئایدیۆلۆژیای چەپگەراییيە ئەمەی پێ خۆشە، هەیە فەنتازییە ئارەزوویەکی تری هەیە، پێوانە لای من بۆ چیرۆکی باش بریتییە لە دارِشتن و شێواز و تەکنیك، هەروەها بابەت، هەر بۆ نموونە سەردەمانێك باو باوی خوێندنەوەی واقیعی سۆسیالیستی بوو هەر ئەو سەردەمە من ئارەزووم لەو شێوازە نەبوو، هەروەها چێژم لێ وەرنەدەگرت، هەندێ چیرۆکی ئێرنست هەمەنگوای هەیە هەر هیچ نییە، بەڵام رۆمانی ( پیرەمێرد و زەریا)ی هەیە کە رۆمانی نایابە، بەڵام خەڵکی ئەوەندە بوێرنین بڵێن ئێرنست هەمەنگوای چیرۆکنوسێکی چاك نییە.

- هەموو قوتابخانە فیکری و ئەدەبییەکان ئەگەر باش کاریان لەبارەوە بکرێت شتی جوانی تێدا دەدۆزرێتەوە، بۆ نموونە لەناو یەکێك لە چیرۆکەکانی کوردی چیرۆکێکم خوێندەوە هی (مستەفا سالّح کەریم) بەناونیشانی (پیر مامەند) چیرۆکێکی واقیعی سۆسیالیستییە، بەڵام زۆر هونەرییانە مامەڵەی لەگەڵ بابەتەکە کردووە؟

- پێموایە (مستەفا سالّح کەریم) چیرۆکنووسێکی باشە، بەڵام ئەویش چیرۆکی ناوەندیشی هەیە، لە شەستەکانەوە مامەڵە لەگەڵ کاری ئەو دەکەم، تەنانەت (رەئووف بێگەرد)یش دوای من دەستی بە نووسین کردووەو چیرۆکنووسێکی زۆر نەتەوەییيە، بۆیە نووسین و داهێنان پێوەندیی بە زەمەن و سەردەم و ئایدیۆلۆژیاوە نییە.

عەبدوڵڵا سەڕاج:

# ڕێگای بە جیهانبوون لە کۆڵانێکی بچووکەوە دەستپێدەکات



دیمانە: فەرەیدوون سامان

گۆڤاری کاروان، ژمارە ٢٥٢

عەبدوڵڵا سەڕاج نووسەر و ڕۆماننووسی داهێنەری کەرکووك زیاتر لە سێزدە ساڵە ئارەزوومەندانە نیشتەجێی وڵاتی فنلاند بووەو سەرباری هەڵکشانی تەمەنی (کە حەفتا ساڵی تێپەڕاندووە)، بەڵام هێشتا هەر خەریکی نووسینە و جارجارەش خۆی خەریك دەکات بە ڕەنگ و ڕەنگکردنی تابلۆیەکی هونەری. تا ئێستا خاوەنی ژمارەیەك کۆچیرۆکە، لەوانە: (لاکێشە ڕووناکەکان) کە پارساڵ لەلایەن ئیسماعیل دەروێشەوە لە پاریس وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فەڕەنسی. (بارام ناوێك هەبوو)، (مردوو خەون نابینێ)، (پەڕەنگ)، (پەیك) کە لە ساڵی **١٩٩٥** لە پاریس بڵاوکرایەوە.

کۆی هەموو چیرۆکەکان لەگەڵ ئەو چیرۆکانەی لە پاش ڕاپەڕین بڵاوبوونەتەوە. هەروەها ڕۆمانەکانیش ئەمانەن:

هەڵکشان بەرەو لووتکە، (کە ئەویش وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فەڕەنسی و فارسی) کاولاش، سۆناتای ڕۆح (دوو جار چاپ کراوە)، کۆچڕەو... کۆچڕەو، ونگە (دووجار چاپ کراوە لە بەرلین و لە کوردستان)، پەرتەوازەکانی ئێرەو ئەوێکانی ڕەوان، ناوێ لەم تێکستە بنێ، ئەژدەر، سلێکۆك.. هۆکلێر، ڕەنگستانی ئەفسانە، یان ئەفسانەی ڕەنگستان. وێڕای چەندان کتێبێکی تیۆری لەوانە: بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان، با لە هونەر بگەین، ئەم کتێبانەشی لە چاوەڕوانی چاپدان: دیداربینییەکانی، شانۆنامەکان-پەیڤستان- ڕۆمانی یازدەهەم بەناوی (چۆن بوومە تیتراسك)، عەبدوڵڵا سەڕاج خەرمان بەرەکەت هەر لە کارو چالاکیدایە، دوای گەڕانەوەی لە وڵاتی فینلاند و لە سەردانێکی بۆ بارەگای گۆڤارەکەمان بە هەلمان زانی سەبارەت بەدوا ئەزموونەکانی نووسین و بەتایبەت لە تاراوگەدا، ڕووبەڕووی چەند پرسیارێکمان بکەینەوە:

- سالآنێکه له هەندەرانیت بابزانین چیتان کردووه و چالاکییه کولتووری و ئەدەبییەکانتان چی بوونه؟

- من ماوه ١٣ ساڵه له فینلەندا دەژیم و لەو ماوەیەدا هەلێکی زۆرم بۆ رەخساوه بۆ خوێندنەوه به زمانەکانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی، ئەو کتێبانەش دەخوێنمەوه که له کوردستان و عێراق دەست ناکەون، لێره له کتێبخانەی شارەکەم و له پایتەختی فینلاند دەستم کەوتوون و هەر لەو ماوەیەشدا شەش رۆمانم نووسیوه و جگه لەوەش کاتم هەبێت به رەنگی ئاوی وێنه دەکێشم.

- رۆمانەکانی ئەمجارەتان لەبارەی چین؟

- هەتا ئێستا (١٠) رۆمانم گەیشتوونەته بەرچاوی خوێنەران، نۆیەمین رۆمانم ئەوه چوار ساڵه راگیراوه و یازدەمینم لەگەڵ خۆم هێناوه، که ناوەرۆکی گشتیان نەتەوەیی و پاراسایکۆلۆژی و سیاسی و کۆمەلآیەتیین، هەروەها فەنتازیایین و هەریەکەیان له شتێك دەدوێن، وەك سەرەنجام هەڵوێستی مرۆڤ له ئایین و له بەرانبەر سیاسەت و ئەم جیهانه چییه، هەروەها وەك مرۆڤێك چۆن دەژیت و چۆن له کەولّی خۆی دەری دەهێنن، ئەمانه بابەتی سەرەکیی رۆمانەکانی منن، بەشێوەیەك دایاندەرێژم هونەری بن، بابەتی سەرەکیش لەلای من ئەوەیه چۆن بابەتەکانم دەگەیەنم نەك چی دەڵێم، چونکه ئەوەی دەیڵێم راستییه، بەڵام چۆنی دادەرێژم ئەوەیان هونەرەکەیه.

- باشه بۆچی نۆیەمین رۆمانت (سلێکۆك.. هۆکلێر) سانسۆری لەسەرەو بریاری له چاپدانی راگیرا؟

- گوایه لەو رۆمانەدا هێرشم کردۆته سەر هەندێك کەسایەتی، منیش وتم ئەمه هێرش نییه و رەخنەیه، ئەگەر قبووڵ بکەن رەخنەتان لێ بگیرێت، چونکه رەخنەی بنیاتنەرم گرتووەو بلاوم کردووەتەوه، رۆمانەکه کورتکراوەی ناوی هەر چوار شارەکەی کوردستانه، سێکۆك له ناوی سلێمانی و کەرکوکەوه و هوکلێر له ناوی هەولێر و

دهۆکەوە وەرگیراوە، وام داناوە کە شتێك هەیە عاجباتی هەشتەمە و دابەشیان کردووە.

- تا چەند هەوڵتداوە چیرۆکەکانت بۆ زمانە بیانییەکان وەرگێڕیت؟

- بەڵێ رۆمانم هەیە وەرگێڕدراوە بۆ چەند زمانێکی بیانی وەك رۆمانی (لاکێشە رووناکەکان)، کاك ئیسماعیل دەروێش لە پاریس بۆ زمانی فەڕەنسی وەری گێڕاوەو لە ۱۹۹۵ چاپ کراوە.

دکتۆر ئەحمەدی مەلا رۆمانی (هەڵکشان بەرەو لووتکە)ی کردۆتە فەڕەنسی، ئەویش نزیکەی ۸ ساڵە گیری خواردووەو لێرەشەوە بیستم کە بەرچڤە کراوە بۆ فارسی، وەك رۆمانێکی کوردی دەنگی داوەتەوەو نزیکەی ۱۸ لێکۆڵینەوەو نامەی دکتۆرا و ماستەری لەبارەوە نووسراوەو تیشکی خراوەتەسەر.

- ئێستا رۆشنبیرانێکی زۆری کورد لە دەرەوەن و تەڤگەرێکی ئەدەبی کوردیش لەوێدا هەیە، پرسیارەکەم ئەوەیە بە رای تۆ شتێك هەیە بە ناوی ئەدەبی کوردی لە تاراوگە، ئایا ئەو تەڤگەرە وەك ئەدەبی تاراوگەی گەلانی دیکە تایبەتمەندیی خۆی هەیە واتە پێتوایە کوردیش ئەدەبی تاراوگەی هەبێت؟

- من باس لە خەڵکی دیکە ناکەم، چونکە زۆری نەمدیوە، بەڵام ئەگەر ئەو شەش رۆمانە بخوێنیتەوە من ئاماژەم بۆ نەکردووە، بەڵکو چیرۆکنووس و رەخنەگر (جەلیل کاکەوەیس) دەڵێت: ئەدەبی تاراوگە لای (عەبدوڵڵا سەڕاج)ە، چونکە من تێکەڵاوی لەنێوان فینلەندا و کوردستان دەکەم، هەتاوەکو شار دەگۆڕم، دەیخوێنیتەوە هەست دەکەیت مرۆڤی کوردی و فینلەندی تێدایە، (ناوێك لەم تێکستە بنێ) هەشتەم رۆمانە و (دکتۆر فوئاد رەشید) زۆری لەبارەوە نووسی و پرۆفیسۆرییەکەی لەبارەی ئەم رۆمانە وەرگرت، بەداخەوە نازانم رەخنەگرانی ئێمە بۆ نایخوێننەوە، مامۆستایانی ئێمە لە زانکۆکان کاتێك رەخنە دەگرن دەڵێن کەسایەتی، جێگا، زەمان، رەنگ لە رۆمانی فلاندا، ئەی من چیم گوتووە؟ ئەم نووسەرە رای چییە؟ باسی ئەوە ناکەن! باس لەو

شتانە ناکەن، کە من بەکارم هێناوە بۆ ئەوەی شتێك بڵێم، ناوێرن باسی بکەن. شتێکی ئاوهایە... لە ڕۆمانی دواییمدا دەڵێم: ڕەخنەگران نانووسن و ناتوێژیننەوە.

- باشە، ئەگەر شتێك بەناوی ئەدەبی کوردی لە تاراوگەدا هەیە، بۆچی ئەو ئەدەبە ناچێتە ناو پێشبڕکێ و ڤیستیڤاڵە جیهانییەکانەوە؟ بۆ نموونە: تا ئێستا دەقێکی کوردی لە دەرەوە خەڵاتێکی وەرنەگرتووە وەك ئەوەی، کە نووسەرانی عەرەب و تورك و فارس خەڵات دەهێنن؟

- ڕێگای تۆ لە ئەدەبی جیهانیدا، لە کۆڵانێکی بچووکەوە دەستپێدەکات. ڕێگا بۆ جیهانیبوون چییە؟ شاکارەکانت وەربگێڕدرێت. ئەوانەی زمان دەزانن کەمتەرخەمن. لێرە وەرگێڕ هەیە، کە عەرەبی و فارسی دەکەنە کوردی. دە تۆ وەرە ئەم ئەدەبە کوردییەمان بکە بە فارسی و.....تاد، دەبینی پڕۆسەکە یەکلاقییە.

- کەواتە، ئێستاکە گەورەترین کێشە لە بەردەم بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردی پڕۆسەی وەرگێڕانە؟

- وەرگێڕان لە کوردییەوە بۆ زمانانی دیکە گرنگە. ئێستا ئەو وەرگێڕانەی دەکرێت-بە قسەی زۆرێك لەو شارەزایانەی دەیانناسم- دەڵێن: بە خراپی و سەقەتی وەرگێڕدراون. ئەوانە فارسی زان نین بۆیەش پێویستە لە زمانی کوردیشەوە وەربگێڕدرێت. (ئیسماعیل دەروێش) وازی لە وەرگێڕانی فەڕەنسی هێنا، چونکە لێرە کارەکەیان بە هەند نەزانی و کاتێك وەرگێڕانی (لاکێشە ڕووناکەکان)م بە یەکێك لە فەڕەنسی زمان نیشاندا گوتی: ئەمە کێ کردوویەتی. گوتم: ئەوە کوردێك وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فەڕەنسی. وەڵامی دامەوە و گوتی: ئەمە لە فەڕەنسی فرەنسیزانترە، بەڵام بەداخەوە ئێستا خەریکی تیجارەتە، خۆ خەڵکی دیکەش هەن، بەڵام کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوەو هانیان نادات!

- بەپێی ئەزموونی خۆت ئێستا چیرۆك و ڕۆمانی کوردی بە بەراورد لەگەڵ چیرۆك و ڕۆمانی بیانی لە چ ئاستێکدایە؟ مەبەستمە بڵێم: ئێمە چیرۆك و ڕۆمانی هونەریمان هەیە؟

- چیرۆك و رۆمانمان هەیە و پێی داگرتووەو دەتوانیٚ بە جیهانیشی حیساب بکەیت، بەڵام لە ئەدەبیاتی جیهانیشدا، چیرۆکی وا هەیە دەیخوێنیتەوەو هیچی ئەوتۆی تێدا نییەو فرێی دەدەیت. ئێمەش لەو جۆرەمان هەیە. ناوەندیمان هەیە و ئەوروپاش ناوەندیی (مەبەستم لە جۆری ناوەندییە) هەیە، باشیشمان هەیە، ئەوروپاش لەو جۆرە چاکەی هەیە. لێرەدا ئاماژە بۆ رێژەیی بۆچوون و هەڵسەنگاندن دەکەم. خۆ هەموو کەسێك نابێتە (مارکیز). لە هەر وڵاتێك ساڵانە دووسەد رۆمان دەردەچێت، خۆ هەمووی خەڵاتی (نۆبڵ) وەرناگرێت.

ئێمە چیرۆك و رۆمان و هونەر و شیعریشمان هەیە. بەداخەوە من خەمم ئەوەیە کە نەوەی تازە ناخوێننەوە! ئەدیبانی خۆشمان کەم دەخوێننەوە! بۆ ناخوێننەوە؟ نازانم. ئەز، کتێب دەدەم بە کەسێك بیخوێنێتەوە -ئەگەر کرا گۆشەنیگای خۆشیم بۆ بدرکێنیٚ- نەك لەناو رەفەی کتێبخانەکەی —بۆ رازاندنەوە- دایبنێت. من بۆ تۆ دەنووسم و تۆ بۆ ناخوێنیتەوە؟

# بەرهەمە چاپکراوەکانی عەبدوڵڵا سەڕاج

## ڕۆمان:

* هەڵکشان بەرەو لووتکە.
* کاولاش.
* سۆناتای ڕۆح.
* کۆچڕەو.. کۆچڕەو.
* ئەژدەر.
* ونگە.
* پەرتەوازەی ئێرە و ئەوێکانی ڕەوان.
* ئەفسانەی ڕەنگستان، یان ڕەنگستانی ئەفسانە.
* ناوێ لەم تێکستە بنێ.
* سلیکۆك..هۆکلێر.. عاجباتی هەشتەم.
* چۆن بوومە تیترواسك.

**چیرۆك:**

* لاكێشە ڕووناكەكان.
* مردوو خەون نابینێ.
* بارام ناوێك هەبوو.
* پەڕەنگ.
* پەیك.
* لاكێشە ڕووناكەكان و ئەوانی تر.

**تیۆرییەكان و هیتر:**

* بەرەو ئاستانەی ڕۆمانی نوێ و گۆشەنیگاكان.
* با لە هونەر بگەین.
* پەیڤستان.
* هەشت دەقی شانۆیی.
* چەند بابەتێك لەبارەی ئەدەبی نوێی كوردییەوە.
* دیداربینییەكانم.
* كەڤاڵە ڕەنگ ئاوییەكانم.